خالید ئێرتوغروڵ

ڕۆمان

# ئێمرێ

## ئاهی ستەمدیدەیەک







ناوی کتێب: ئێمرێ (ئاهی ستەمدیدەیەك)

نووسینی: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕانی: شاگوڵ جەلال

بەراوردکردنەوەی: تارا محمد

داڕشتنەوەی: بەفراو جەمال

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە(١٤٤٢)ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# پێشەکی



ئـەم پەرتووکـە بەسـەرهاتی واقیعیـی ژیانێکـە و، ڕاسـتەوخۆ لـە (ئێمریێ)وە گوێم لێی بووە، کە بەتەواوی سەراسیمەی کردم.

بەڕاستی باسی ئازار و نەهامەتی ژیـانی ئێمـریێ جـەرگبڕبوو، نـازانم چۆن مرۆڤێك دەتوانێت بەرگەی وەها ئازارێك بگرێت؟

سـەختییەکانی ژیـانی ئـەو وەك پشـکۆ ناخیـان دەسـوتاند و، نەمـدەتوانی بـاوەڕ بـەوە بکـەم کـە دەمبیسـت و، بیروهۆشـم بـۆ کۆنەدەکرایەوە.

ژیـانی پـڕ ناسـۆری ئـەم مرۆڤـە سـەراپای بـوونمی داگیرکردبـوو. تەنانـەت بـە گـویێ ڕادێـرانیش بـۆی تـەزووی سەرسـامی بەلەشمـدا دەهات.

ئای ژیان؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێت بەرگەی ئەم هەموو ئازارە بگرێت، ئێمریێ وەك بلێی لە دۆزەخدا ژیابوو. لەچاوەکانی ئەویشەوە فرمێسك دەڕژان، ئەو فرمێسکانەی دلۆپی ئاو نا، بەڵکو کلپـەی ئـاگر بـوون... نەمتوانی چیتر بەرگە بگرم و، پێم وت:

– بەڕاستی ژیانت بەسەرهاتێکی پڕ پەندە، ڕێم پێ دەدەی ڕووداوەکان وەك تێبینی لای خۆم تۆمار بکەم؟ دەمەوێت لەگەڵ خوێنەرەکانمدا هاوبەشی پێ بکەم. لەو باوەڕەدام هەر کەسێك چیرۆکی ژیانت بخوێنێتەوە، سەرلەنوێ چاوێك بەژیانیدا دەخشێنێتەوە و، هەست بە پێویستی و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ژیانی دەکات.

بە نیگا خەماوی و بێ پەرواکانی لێی ڕوانیم و وتی:

– ئەوە چ قسەیەکە مامۆستا، بە پێچەوانەوە، منەتباری ئێوە دەبم، ئەگەر ئەم کارە بکەن.

با بەسەرهاتی ئەو هەڵانەی ئێمەیان بە شکستتدا بردو، ئەو ئاگرەی ئێمەی سوتاندو، ئەو داوانەی بەرەو هەڵدێریان بردین، بیخوێننەوە، بۆ ئەوەی خۆیان لێ بپارێزن. تەمەنی ئێمە بەفیڕۆ چوو و گوزەشت، با ژیانی پاکو بێگەردی ئەوانیش لەکەدار نەبێت.

با ئەوان بە ڕووی سپییەوە ژین بکەن. مامۆستا، زۆر ئاساییە لام ئەگەر تۆماری بکەن. با لەبری ئەم هەموو هەڵانەی ژیانم، چاکەیەکم هەبێت گەر بچووکیش بێت. ناونیشانی خۆم مەنووسن، یاخود بیگۆڕن. ڕەنگە بەمە هەستی کەسانێك بروشێت کە هێشتا ئێمە بەخزم دەزانن، باتووڕەیان نەکەین و، ئابڕوویان پارێزراوبێت.

زۆر ئاساییە لام ئەگەر بەسەرهاتی ژیانی من پێشکەشی خوێنەران بکەیت، تا ژیانی کەسانی بیّ تاوانی ترو خەیاڵەکان پێش چرۆکردنیان وشك نەبن. وشە ئەسرین ئامێزەکانی ئەم مرۆڤە نامۆو، ماندوو و بێزارەم لەگەڵ ئەسرین ڕشتندا خستە سەر کاغەز، بێگومان بەکارهێنانی ناوی خوازراو خواستی ئێمریّ بوو.

لەکۆتاییدا ئەم پەرتووکە کاریگەرەی لیّ دەرچوو کە هیوادارم هەمووان بیخوێننەوە، چونکە بەدرێژایی ماوەی نووسینەوەی هەر لاپەڕەیەکی، هەر پەرەگرافێکی ئەسرینم ڕشتووە.

کاتێك زۆر بە دژواری پێشم لە گریانی خۆم دەگرت و، بە هەنسکەوە گوێبیستی ئەم ڕاستییە پڕ پەندانە بووم، دەبوو چی ترم بۆ زیادبکردایە؟! هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرا بوو.

بەسەرهاتی ژیانی ئێمریّ هێندە پەند ئامێز بووە، کە هەرکەس لەجێی من بیخوێنێتەوە هەمان هەستی لا گەڵاڵە دەبێت. ڕووداوەکانی بەسەرهاتەکە باس لە بارودۆخی ژیانی کۆمەڵگەیەك و ماوەیەك دەکات. لەوەش گرنگتر بە پێشکەشکردنی ڕێگای دەرچوون لە جەنجاڵی کۆمەڵگە و، چەوتیی و ناپاکییەکانی نێوی، تا بڵێی چارەسەری گرنگ دەخاتە بەر دیدەی خوێنەران، بۆیە ئەم پەرتووکە لە ژیانی هەموو کەس و هەر قۆناغێکدا تایبەتمەندییەك وێنا دەکات.

ڕەنگە ئەو پرسیارە لە خۆتان بکەن، کە بۆچی لە کتێبەکانماندا بابەتە لەیەکچووەکان زۆر دووبارە دەبنەوە؟

یەکەمین: هۆکاری ئەمە دوو خاڵی سەرەکییە:

١- ڕووداوەکانی ناو ئەم کتێبە بەرهەمی خەیاڵ نین. لەلایەن نووسەریشەوە هەڵنەبەستراون. بەپێچەوانەوە هەموویان لە بەسەرهاتی ڕاستەقینەی ژیانەوە وەرگیراون.

٢- هەرچۆن ڕوویانداوە بەو شێوەیە نووسراونەتەوەو، بەهیچ جۆرێك دەستکارییان نەکراوە.

دووهەمیش: باسەکانی ناو پەرتووکەکە باسگەلێکن کە ورەی کۆمەڵگا بەگشتی و گەنجان بەتایبەتی بەرزدەکەنەوەو، لەو بابەتانەن کە ڕەنگە ڕۆژانە ڕووبەڕووی خوێنەران ببنەوە.

ئەم کتێبە ناخی مرۆڤ دەهەژێنێت و، بەنێو ئەو ژیانە پڕ ناسۆرییەدا گوزەری پێ دەکات، تا چەندین شێوەی سەختی و ئازار چەشتنی وێنا بکات، داستان ئاسا بەتەواوبوون لە خوێندنەوەی ئومێدێکی نوێ لە ئاسۆدا بەدی دەکەین.

ئەم بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرە پێشکەشی ئێوەی خوێنەر دەکەم.

خالید ئێرتوغروڵ

# بەشی یەکەم
## مەرگی دڵتەزێنی باوکم



**قیامەت...**

**ژیانێکی دۆزەخ ئاسا.. یا قیامەت**

ئاخۆ دەکرێت مرۆڤ لەنێو دۆزەخدا لەگەڵ پشکۆو دوکەڵی ئاگردا ژین بکات!

ئەوانەی سەرگوزشتەی ژیانی من دەخوێننەوە، زۆر باش لە واتای ئەم ژیانە تێدەگەن. هەموو مرۆڤێك کەماڵئاوایی لە ژیان دەکات، قیامەتی دەست پێدەکات، بەڵام من کەسێکم کە هەر لەو قیامەتەدا چاوم بە دونیا هەڵهێناوە.

ئەو قیامەتەی کە هەموو کەسێك یەکجار ڕوبەڕووی دەبێتەوە، من سەدان جار ڕووبەڕووی بومەتەوە. ئەو تاڵیی و ناسۆرییەی ڕەنگە هەموو کەسێك یەکجار بیچێژێت، من بەشێوەیەکی لە ژمارە نەهاتوو چەشتوومە.

ئێستا بیردەکەمەوە، چۆن توانیوومە بەرگەی ئەم هەموو ئازارە جەرگبڕانە بگرم؟

چۆن لەگەڵ شەپۆلە خنکێنەرەکانی ژیاندا نقوم بووم. ڕەنگە پەروەردگار هەموو ئەمەی بەسەرهێنابێتم، بۆ ئەوەی دواتر ئەزموونی ژیانم بۆ نەوەی نوێ و، گەنجە بێتاوانەکان باس بکەم، بۆ ئەوانەی کە لە داوەکانی ژیان بێئاگان.. بۆ ئەوەی ببمە پەند بۆ ئەو کەسانەی بەبێ سەروبەری و بێ ئامانج درێژە بە ژیانیان دەدەن، تا ئەوانیش گرفتاری هەمان هەڵە نەبن.

کێ ئەزانێ... ڕەنگە وابێت..

* * *

کاتێك بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا هەستی هاتنی قیامەتم چەشت، تەمەنم تەنها چوار ساڵ بوو. منداڵێکی بێ گوناه، بێتاوان و، بێئاگا لە گورزە بکوژەکانی ژیان...

هەر ئەم یەکەمین گورزەش بوو هەموو ساتێکی ژیانمی قیامەت ئاسا گۆڕی. هێندە ترسناك بوو، کە هەموو ئومێدەکانمی لەناو برد، دنیای لێ تاریك کردم. یەکەم وانەی ژیانی دادام، تەواوی بوونمی خاپوور کرد، پاش ئەوە فرمێسکەکانم بە ئەستەم دەگیرسانەوە.

ئەم قیامەتەش دیمەنی لاشە پارچەکراوەکەی باوکم بوو، کە هەموو لاشەی بە ئەشکەنجەوە لەت کرابوو.

دایکیشم –کە نەخۆشی گورچیلەی هەبوو– لەگەڵ چوار خوشـك و بـرای بچـوکمدا شـپرزە بوویـوو، هــەمووومان باوەشمـان کردبـوو بـە تابووتەکەی باوکمدا، بە هات و هاوار دەمان ناڵاند.

ئەمە بەتەواوی قیامەتێك بوو بۆ ئێمەو، منیش لەدنیا ساواکەمدا بۆ یەکەم جار تاڵاوی بێئومێدی و بێچارەییم چەشت.

ئـــای خوایـــەگیان! چ دیمـــەنێکی تۆقێنـــەر بـــوو! تەنانـــەت بیرکردنەوەش لێی مرۆڤ دەهەژێنێت. داخۆ هیچ مرۆڤێك هەیە بەرگەی ئەو هەموو ئەشکەنجەیە بگرێت؟!

ئایا لە دنیادا کەسانێکی وا هەبوون کە بەو ئەندازەیە بـە نـاڕەوایی و بە بێ ڕەحمانەو دوور لە هەموو هەستێکی مرۆڤانـە ڕەفتـار بکـەن؟ دەبێت ئەوانەی لاشەی باوکمیان وەك قەصاب پارچە پارچە کردبـوو، چـەند کینـە لـەدڵ بـووبن! دەبێـت بـاوکم لـەنێو ئەشـکەنجەو ئـازاردا چەندێك هاواری کردبێت و، داوای یارمەتی کردبێت!

زۆر ترسـناکە! تاوانێکـە، ویـژدان دەهـەژێنێت، بەدرێـژایی تەمـەنم نـەمتوانی ئـەو دیمەنـە لەبەرچـاوم بسـڕمەوە. نـەمتوانی خـۆم لـە کاریگەری ئەو دیمەنە ڕزگـار بکـەم. سـیما تاسـاوو ڕووخسـارە ڕەنـگ پەڕیوەکەی لـە خـەیاڵم دەرناچـن. لەوانەشـە بنچینەی تێـڕوانینم بـۆ کینەو بێزاریی لە ژیانمدا ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی تێدابێت.

## نەریتی دوژمنایەتی:

دوژمنایـەتی سـیمای ژیـانی ئێمـە بـوو. لەگـەڵ دوژمنایەتیـدا دەنووستین و، لەگەڵ دوژمنایەتیدا بە ئاگا دەهاتینـەوە. ئەمـە زامێك و، کینەیەك و، نەفرەتێك بوو، کە ساڵەهای ساڵە و لەوانەشە چـەندین سەدە سارێژ نەبووەو نابێت.

هەموو پلانەکانی ژیانمان، لەسەر بنەمای تۆڵەسەندنەوە دارِشتبوو، هـەرکات دەوڵـەت بەدادگەریـەوە لەناحـەقی نزیـك نەبێتـەوەو، ستەملێکراو و بێتاوان نەپارێزێت و، ستەمکار و تاوانباریش بەو سزایە نەگەیەنێت کە شایەنیەتی، ئەوا هـەموو کـەس تـا هێـزی برِبکـات لای خۆیەوە دادگەری دەکـات. بێگومـان ئەمـەش بـە تـرس، ئەشـکەنجە، خوێن و، دواتر مەرگ کۆتایی دێت.

ئەگەر کەسێك لە منداڵەکەت بدات، تۆش ناچار لە دژی ئـەو کەسـە هـەموو هێـزت دەخەیتەگـەڕ، ئەگـەر کەسـێك رێگـەت پێبگرێـت، تـۆ بەشێوەیەکی توندتر بەرپەرچی دەدەیتەوە.

ئەگەر کەسـێك بکوژرێـت، ئـەوا بـە کوشـتنی بکوژەکـەی، ژمـارەی مردووی هەردولا بەرزدەبێتەوە بۆ دوان.

لەرِاستیدا ئەمە پیشاندانی هێـزەو، هـەر ئەمەشـە کـە ژیـانی مـرۆڤ وێران دەکـات.. ئێسـتا کـە بیردەکەمـەوە، بـەخۆم دەڵـێم کـە بۆچـی ئەزموونی یەکگرتن و پێکەوەژیانمان تاقی نەکردۆتەوە؟ بۆچی کاتێك

منداڵەکان ڕێیان بە یەکتر گرتووە و، بەشەڕدا هاتوون، لەجێی لێدان، بەقسەی خۆش و زمانی شیرین ڕونکردنەوەمان نەداوە؟ بۆ ڕێگاکانی چارەسەرو پێکهاتن نەگەڕاوین؟ بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو ڕێیانەمان گرتووەتەبەر کە ڕووداوەکەیان چڕتر کردووەتەوە.

## شەوان بە نۆبە ئێشکمان دەگرت:

کە شەو دادەهات، دەرگا و پەنجەرەکان دادەخران. پیاوەکان میلیان لە چەکەکانیان دەهێنایەوە، تا ئەگەر شەو لەلایەن دوژمنەوە خافڵگیرکران، دەستبەجێ بتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە، تا زەردەپەڕی بەیانی لە ئامادەباشیدابوون. شەوانی ئێشکگرتن بوویبووە کابوسێك، خەوتن و، بەخەبەر بوونیش نە بە ڕۆژ و نەبەشەو مرۆڤی ئاسوودە نەدەکرد. هەردەم ترس، دوودڵی، دڵەڕاوکێ، وەك بڵێی ئەمە ژیان نا، بەڵکو شانۆیەك بوو بۆ ئەشکەنجەدان، لە سەرای دادگایەکی دوانەهاتووی بێ ئەنجامدا بووین، لەم جەنگەڵی دڕندایەتییەدا باوکم کۆتا قوربانی بوو، کە دەبوو بەرەنگاری ئەمە ببێتەوە، بەڵام چۆن؟

لەبەر ئەمە لە (ئورفا)وە هەڵهاتین. لایەنی بەرامبەر لە ئێمە بەهێزتر بوو، تەنها کەسیش کە بەرهەڵستی دەکردن باوکم بوو، بەڵام ئەوان بەو شێوە نامرۆڤانەیە کوشتیان و، ئەمەش سەرەڕای سنووردانان بۆ بەرهەڵستی بنەماڵەکەمان، پەیامێکی تۆقاندن و ئاشکرابوو بۆ ئێمەش.

واتە "ئەگەر سنووری خۆتان نەزانن، سەرەنجامی هەمووتان بەم جۆرە دەبێت".

لەم بەرەیەدا جگە لە ئێمە کەس نەمابوو، کێ تۆڵەی باوکمی دەسەندەوە؟ خزمەکانی دایکم پەیوەندی خزمایەتییان لەگەڵ پچڕاندبووین، چونکە کاتی خۆی باپیرم ڕازی نەبووە بە هاوسەرگیری دایکم لەگەڵ باوکمدا.

هەربۆیە پەیوەندییان لەگەڵماندا پچڕاندبوو، هاوکارییان نەدەکردین، سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەتییەی بەسەرماندا دەهات، نە خاڵەکانم، نە پوورەکانم، نە باپیر و نەنکم، هیچ کامیان یارمەتیان نەدەداین، سەرەڕای ئەوەی دەوڵەمەندیش بوون.

## مرۆڤ هیچ نرخێکی نەبوو

بنەماڵەی ئێمە تەنها باوکم و مامێکم هەبوو. لەڕاستیدا نەوەکانی خێزانی باوکم چوار بوون: بەڵام دوانیان لە لایەن دوژمنەکانمانەوە کوژرا بوون. یەکێك لە پوورەکانم لەگەڵ مێردەکەیدا بەیەکەوە بووبوونە نیشانەی گوللەی دوژمنەکانمان. ئەوەی دووەمیشیان لەکاتی ئاهەنگی هاوسەرگیرییدا...

ئەمانە، ڕووداوگەلێکی زۆر دڵتەزێن و جەرگبڕبوون، چ بۆ دوژمنەکانمان و بۆ ئێمەش. ئەوەی هەرگیز نەدەبوو ڕوویدات، بەسەرماندا هات. مێردی پوورەکەم بە ئومێدێکی گەورە و بەپەرۆشیی

خزمـــەتی ســـەربازی گەڕابوویـــەوە. شـــەوی ئاهەنگەکـــەی بـــوو، چارەنووســی کۆتــایی هــەردووکیان زۆر ســامناك بــوو. ئــەی داخ و پەژارەی خزمانیان؟ ئازارەکانی ئێمە لە باسکردن نایەن، چونکە بە تەنها و بێچارە مابووینەوە. ئەو مامەم کەلە ژیانـدا مـابوو کەسێکی کەم ئەندام و نەخۆش بوو، نەیتوانی بەپێی پێویست یارمەتیدەرمان بێت. لەبەر گیانی خۆی زۆر لـە ئێمـە نزیـك نـەدەبۆوە، پوورەکـەی تریشم چیتر بەرگەی ئەم بازاڕی گیانکێشانەی نەگرت و، کۆچی کـردو ڕۆیشت.

بۆ چەندین ساڵ بە هیچ شـێوەیەك هـەواڵێکمان پێـی نـەزانی. ئـەو گەڕانەش کە بە ئومێدی دۆزینـەوەی پـورم کردمـان، دیسـان تووشـی شکستی کردین، چونکە لەگـەڵ مێردەکەیدا لـەماڵی خۆیانـدا بـەهۆی ژەهراوییبوونەوە بە غاز مردبوون. ئایا بەڕاستی ڕووداوێك بـوو یـاخود بەدەستی ئەنقەست بوو، نازانم!

بــەڵێ بــەو شــێوەیە دایکــی نــەخۆش و بێچــارەم لەگــەڵ چــوار منداڵەکەیدا مابوویەوە. ڕۆژانێکی وەها سـەخت چـاوەڕێیان دەکـردین کە گێڕانەوەی ڕووداوەکانیشیان دژوارە؟ بەڵام هەرچەند سەخت بێـت و وزەی خامەکەشم بەپێی پێویست نەبێت، باسی ئـەو ڕۆژگـارە تـارو تاڵانە دەنووسمەوە.

## باوکم لەکاری نابەجێوە تێوەگلابوو:

باوکم کەسێکی ژیرو فێڵباز و خاوەن سیمایەکی جوان بوو، دەتوانم تێبگەم کە بۆچی دایکم ئەوی خۆشویستووە. وەك دەڵێن: گەنجێکی سەرنجڕاکێش بووە، بەڵام وەك هەرکەسێکی تر هەڵەشی کردووە. گەورەترین هەڵەی ئەو ئەوە بوو کە حەرام و حەڵاڵی لەیەك جیانەدەکردەوە و، ماوە ماوەش لەکاری گومانلێکراوەوە تێوەدەگلا.

لەلایەکەوە دوژمنەکان، لەلایەکی ترەوە خواردنەوە و، قومار و، پەیوەندی ناشەرعی و چەندین هەڵەی تریش... من ئەو ڕۆژانەم وەك خەیاڵێك لەیادە، دایکم ڕۆژ تا ئێوارە تکای تێدا دەکرد:

"پیاوەکە، ئەو کارانە مەکە! بیر لە من و منداڵەکان بکەرەوە. ئەم شێوازی ژیانە، هیچ کەسێکی تێر نەکردووە. ئەم کارانە هەمیشە بە نەگبەتی و دەردی سەری کۆتاییان هاتووە..."، بەڵام باوکم، گوێی بەم قسانە نەدەداو، دەرنەدەکەوت کە بیانبیستێت.

باوکم لای کەسێکی دەوڵەمەند کاری دەکرد، کە بە (تۆپاڵ حەمدی) ناسرا بوو، (تۆپاڵ حەمدی) ناوو شۆرەتێکی باشی لەنێو خەڵکدا نەبوو، گازینۆ، قومارخانە، بازرگانی بە ئافرەت، مادە هۆشبەرەکان: بەکورتی هەموو جۆرە کارێکی خراپی بەڕێوە دەبردو، چەندین پیاوی وەك باوکم کاریان بۆ دەکرد.

هەموو ئەم پیاوانەش قوربانی تێوەگلان بوون بەکاری گومانلێکراوەوە.

(تۆپاڵ حەمدی) قاچی لەپێکدادانێکدا شکا بوو، بەشەلیی مابوویەوە. هەروەها یەکێك لە تایبەتمەندییەکانیش ئەوە بوو، کە دۆستێکی نزیکی دوژمنەکانی بنەماڵەی ئێمە بوو. نهێنی کوشتنی باوکیشم هەر ئەمە بوو.

ئاخۆ باوکم بەهۆی کارێکی هەڵەیەوە لەلایەن (تۆپاڵ حەمدی)یەوە درابوو بەکوشت، یاخود لەلایەن دوژمنەکانمانەوە ؟ لەوانەشە هەردوولا کارەکەیان بە هاوبەشی ئەنجام دابێت. بە سەرنجدان لەو شێوازە نامرۆڤانەیەی باوکمی پێ کوژرابوو (تۆپاڵ حەمدی)م بە خەیاڵدا دەهات، چونکە دوژمنان لە بنەماڵەی یەکتری دەکوژنەوە، بەڵام بەم شێوەیە ئەشکەنجەی کەس نادەن.

باوکیشم بەشێوەیەکی دڕندانە کوژرابوو، بەڵام ئەو گریمانەیەش هەبوو، کە باوکم لەکاری گومانلێکراوو ئابڕووبەردا تێوەگلابێت.

بەمجۆرە دوژمنەکانی خێزانەکەم زیادیان کرد: حەمدیەشەل لەگەڵ دوژمنە کۆنەکانمان. بە کورتی هیچ دۆستێکمان نەبوو. تاکە ئاسوودەیی منیش ڕاکشان لەئامێزی دایکم و، گریان و فرمێسك ڕشتن بوو.

ئاه، لەو بێ کەسییە ! ئاه چ بێچارەییەك بوو!

خوایە گیان! هەرگیز ئەو ڕۆژانەمان پێشان نەدەیتەوە جارێکی تر، ئەوەی ئێمە چەشتمان بەسەر کەسدا نەیەت. بێچارەییمان لە باسکردن نایەت.

نەمانتوانی لاشەی باوکم بنێژین و، دوو ڕۆژ لەماڵەکەماندا مایەوە. دواتر لە شارەوانییەوە هاتن و بەخاکیان سپارد. دایکی ڕەحمەتیم، ئەڵقەی بووکێنی خۆی لە مەسرەفی بەخاکسپاردنەکەی باوکمدا بەخەرج دا. خانوویەکی کرێ... دایکێکی نەخۆش... چوار منداڵ لەباوەشی دوورناکەونەوەو، شایەتحاڵی فرمێسکەکانی ئەو بێچارەیەن....

## ڕۆژگارە پڕ نەهامەتییەکان:

لە خانوویەکی بچووکی کرێدا دەژیایین. دایکم شەو تا بەیان بەدەست ئازاری گورچیلەوە دەینالاند. خواردن و خواردنەوەی پێ نەدەخوراو، دەستەکانی و ڕووخساری دەئاوسان، ڕووی زەرد هەڵدەگەڕاو، تروسکایی تێدا بەدی نەدەکرا. من و خوشك و براکانیشم لەبەر ئەوەی لە حاڵی دایکم تێنەدەگەیشتین، زۆرجار بە یاری و ڕەفتارەکانمان ئەومان بێتاقەت دەکرد، بەڵام کە هەستمان دەکرد دایکم بەدەست ئازاری زۆرەوە دەناڵێنێ و، کە گوێمان لە ئاهەکانی دەبوو و لە دەوری کۆدەبووینەوە و، ئێمەش دەگریاین. وامان دەزانی دایکیشمان وەك باوکمان دەمرێ. دەردەداریی دایکم بەشێوەیەك

بوو، که لەبەیانیەوە تا ئێوارە، جاری وا هەبوو لە ئێوارەشەوە تا بەیانی ڕۆژی دواتر بەردەوام ئازاری دەبوو. ئێمەش شەوانە بەدەم گریانەوە دەنووستین.

ئەو ڕۆژگارە زۆر ڕۆژ هەبوو کەبەبرسی سەرمان دەنایەوەو. جار هەبوو پارچە نانێکیشمان دەست نەدەکەوت. ناو بەناو دراوسێکان بەزەییان پیاماندا دەهاتەوە و، خواردنیان بۆ دەهێناین، بەڵام ئەم یارمەتیانەش نەمان. چونکە دوژمنەکانمان دەیانویست بێچارەمان بکەن و، بەهەڕەشەکردن لە دراوسێکانمان، ڕێگریان دەکردن بەوەی یارمەتیمان بدەن. دایکم چوو بۆلای (حەمدیە شەل) بۆ ئەوەی حەقی باوکمی لێ وەربگرێتەوە، بەڵام ئەو هەم دەریکردبوو و، هەم قەرزەکانی باوکیشمی نەدابوون و، بە هەڕەشەوە پێی وتبوو: بەگیانی خۆت دەیاندەیتەوە؟" دایکم کە هاتەوە بۆ ماڵەوە زۆر ڕووخابوو، زۆر پەرێشان بوو. ئای دایکە گیان، چیت چەشتبوو، چی!...

دایکم ئەو شەوە زۆر پەرێشان بوو، هات و هاوار لە تاو ئازارەکانی دەینالاند و، دەیوت: موسوڵمانێك نییە، بەندەیەکی خوا نییە؟ وا ئەمرم، یارمەتیم بەن!"، من لەو کاتەدا چوار ساڵان بووم. خوشك و براکانم لەمن بچوکتر بوون.

دایکم هاواری دەکرد و دەیوت:"یەکێ نیە فریامان بکەوێت؟" ئێمەش بەدەنگی بەرز هاوارمان دەکرد "برسیمانە، نان". خوشکێکم بچوکترین منالّمان بوو. هێورکردنەوەی مەحالّ بوو و بەردەوام دەگریا.

# بەشی دووەم

## پیرە پیاوێکی نوورانی



کەسێك ئەو شەوە گوێبیستی ناڵەو ئازارەکانی دایکم و، هات و هاواری ئێمەی برسیی بوو بوو. لەڕاستیدا ماڵەکەمان بە دەنگی هات و هاواری ئێمە هەژابوو، کاتێك لە دەرگا درا، پیاوێك بە بەرگێکی دڕاو و کۆن و، دیمەنێکی سواڵکەر ئاساوە هاتە ژوورەوەو، بە وتنی: "بۆ خاتری خوا یارمەتییەك" سەری هێنایە ئەو ژوورەی ئێمەی لێ دانیشتبووین.

پیاوێکی زۆر پاکوخاوێن دەهاتە پێش چاو، دیمەنێکی نوورانی و، ڕووخسارێکی گەشاوەی هەبوو. بە زمانێکی منداڵانەوە وتمان: "هیچمان نییە بیدەین بە ئێوە"، بۆ ئەوەی پیاوەکە بە تەواوی دڵنیا ببێت، کە هیچ خواردنێك شك نابەین، مەنجەڵی نانەکەم بردو نیشانم دا. پیاوە نوورانییەکەش خەندەیەکی میهرەبانانەی کردو، مەنجەڵەکەی لە دەستم گرت و، لە جانتاکەی دەستیدا خواردنی

دەرهێناو، مەنجەڵی نانەکەی ئێمەی بەنان و، سەوزەو، میوە پڕکرد. ئەوەندەی لەیادم بێت، بڕێکی باش خواردنی تێ کرد، پاشان لەبەردەم دەرگاکەدا بەجێی هێشت و، ڕۆیشت.

ئێمەش بە پەرۆشەوە دەستبەجێ خۆمان گەیاندە خواردنەکە. بەڕاستی ئەو مەنجەڵە بۆ ئێمە وەك گەنجینەی بەرەکەت وابوو، خواردنەکەی بەشی چەند ڕۆژێکی کردین.

سەیرترین لایەنی ئەم ڕووداوە، لەناو مەنجەڵکە دەرمانی تێدا بوو. دایکم پاش خواردنی ئەو دەرمانانە، کەمێك هاتەوە سەرخۆی. ئێمەش بەوە زۆر خۆشحاڵ بووین. دایکی ڕەحمەتیم چەندەها جار ئەم ڕووداوەی بەم شێوەیە بۆ باس دەکردین کە:"ئەو پیاوە سواڵکەر نەبوو، بەندەیەکی باشی پەروەردگار بوو".

دایکم خانمێکی باوەڕ پتەو بوو. تەنانەت لەبەرامبەر سەختترین و بەئازارترین کێشەکانی ژیاندا، مەزنترین ئارامگرتنی پیشان دەداو، پشتی بە خوای گەورە بەستبوو و، هەرگیز ناشکوری نەدەکرد.

ساڵێ، یان ساڵ و نیوێ بەسەر ئەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەدا تێپەڕیبوو، ئەو پیاوە میهرەبان و نوورانییە، جارێکی دیکەش یارمەتی ئێمەی دا.

لەبەر ئەوەی ماوەی شەش بۆ حەوت مانگ نەمانتوانی کرێی خانووەکەمان بدەین. خاوەنماڵەکە وەدەرینراین. لەڕاستیدا

کەلوپەلێکی وەهاشمان شك نەدەبرد؛ خاوەن قەرزەکانی باوکم کە حاڵ و گوزەرانی ئێمەیان دەبینی، لە وەرگرتنەوەی قەرزەکانیان بێ ئومێد دەبوون و، هەندێکیان ئەو کەلوپەلانەمان کە پارەیان دەکرد، لەجێی قەرزەکان بردیان، لە سەرەتادا سەلاجەو تەلەفزیۆنەکەمان، پاشان تاقمە قەنەفە کۆنەکەمان و، دواتر تاقمی ژووری نووستنەکەی دایکم. بەجۆرێك لە ماڵەکەماندا تەنها غازو تەباخێکمان مابوو، ئەویش جارێك یەکێك لە خاوەن قەرزەکان ویستی بیان بات، بەڵام کە ڕووخسای داماو و بێ چارە و فرمێسکاوی دایکمی بینی، بەزەیی پێماندا هاتەوەو، داینان و ڕۆیشت.

بەم شێوەیە ساحێب خانووەکە بە خۆمان و ئەو کەلوپەلە کەمەوە کە مابوومان وەدەریناین، ئێمەش بێچارە تێرامابووین. نەماندەزانی چی بکەین و، ڕوولەکوێ بکەین. یەکەم شەومان لەسەر شەقام و لەژێر ڕۆشنایی کزی ئەستێرەکاندا بەڕێ کرد. دایکی ڕەحمەتیم تا بەرەبەیان بەدەم ئازارو ناڵەوە لەخوای گەورە پاڕایەوە و، نزای کرد.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر بە تینی گەرمی تیشکی خۆری هاوین بە ئاگاهاتینەوە و، سەرلەنوێ ڕۆژێکی دیکەمان بە ئازارو ناڵەی دایکم و، سکی برسییەوە دەستپێکردەوە.

ڕۆژانە زۆر بە زەحمەت پارچە نانێکی وشکمان دەستدەکەوێت.

بۆیە کاتێك دەبینم، بە چەندەها تەن خۆراك فڕێ دەدرێتە زبڵخانەوە، دەستبەجێ دیمەنی ئەوانە دێتە پێش چاوم، کە بەدەست برسێتیەوە دەناڵێنن. بەهەرحاڵ منیش لەڕیزی ئەو برسییانەدام، بێگومان زاتی خاوەن دادپەروەری ڕەها، دادگایەکی مەزنی بۆ ئەم نایەکسانیی و برسێتییە ئامادەکردووە، ئەگەرنا ناسۆری ئەم هەموو برسێتییە بەچی دەرەوێنرێتەوە؟

بێ لانە کەوتین، پێویستی دەست بە ئاوگەیاندن و، خۆراك و، .... تەنانەت هیچ پێویستییەکی سەرەتایی ژیانێکی ئابڕوومەندانەمان دەست نەدەکەوت، دایکم لە تاودا، بەچۆکدا هات و، کڕنووشی بۆ خوای گەورە برد، بە هاوارێکی پڕ ئازارو بێ چارەوە وتی: "خوایە گیان، بە هانامانەوە بێیت، بە میهرو بەخشندەیی خۆت دەستگیرۆییمان بکەیت، کۆمەکی خۆتمان فریا بخەیت"، بەم جۆرە دەیناڵاندو دەیوت: "هیچم لەدەست نایەت، بەڕاستی نازانم چی بکەم، خوایەگیان لەبەر خاتری ئەم منداڵە بێ تاوانانە وەرە بە هانامانەوە".

لەو کاتەدا ئۆتۆمبێلێك لە نزیکمانەوە وەستا. شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە وتی: "دەی سەرکەون، با بڕۆین".

ئاوڕمان دایەوە، من پاش ئەوەی باش سەرنجم دا، وتم خۆ ئەوە ئەو پیاوەیە کە داوای خێرەکەی لێکردین و، دواتر خواردنەکەی بۆ جێهێشتین... ئەو سیما نوورانیەو، ئەو خەندە شیرین و میهرەبانە

تەنها لەو دەکەن، چۆن بتوانم ڕووخساری کەسێکی وا لەیاد بکەم، بێگومان لە یادم ناچێت.

دایکم پرسی: "بۆ کوێ دەڕۆین، ئێوە کێن؟"

شۆفێرەکە وتی:"خانوویەکم بۆ دۆزیونەتەوە، تا تێیدا نیشتەجێ ببن".

بە هەرحاڵ دایکم وەك ئەوەی لە بابەتەکە تێگەیشتبێت، هیچ ناڕەزاییەکی نیشان نەدا.

## سەرمان سووڕمابوو:

شۆفێرەکە کەلوپەلەکانمانی کردە ئۆتۆمبێلێکەوەو، ئێمەش سەرکەوتین. لەڕێدا هیچ قسەیەکی لەگەڵ نەکردین، تەنها بە دایکمی وت:"ئەم کتێبە بخوێنەرەوە".

دواتر بۆم دەرکەوت ئەو کتێبەی پیاوەکە دابوویە دایکم (جەوشەن) بوو. دایکیشم بێ وچان و بەردەوام دەیخوێندەوە و دەیوت:"ئەم جەوشەنە دەبێتە شیفا، مایەی حەوانەوەی دەروونە، ساڕێژکاری ئازارەکانمە".

لەبەردەم خانوویەکی خنجیلەی سادەدا وەستاین، کە چووینە ژوورەوە، بینیمان خانووەکە خۆی کەلوپەلی ناوماڵی تێدا بوو، تەنانەت چێشتخانەکەشی پڕکرابوو لە خواردن. شۆفێرەکە ئێمەی لەو ماڵەدا جێهێشت، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات وتی:"خاوەن ماڵەکە

کرێتـان لێ وەرناگرێـت و، خـەمتان نـەبێت، بـەردەوام پشـت بـەخوای گـەورە ببەسـتن، پـەروەردگارم گـەورەترین هـاودەمی نـەخۆش و، دڵشکاوو، بێ نەواو، ستەمدیدەکانە، ئێوە تەنها ئـارامبگرن" و، پـاش ئەوە ڕۆیشت.

نیشـتەجێبوونمان لـەو خـانووەدا وەك چـەژنێك وابـوو، هـەموومان بەخۆشحاڵییەوە دەستمان بە نـان خـواردن کـرد، زۆر بـە پەرۆشـەوە نانەکەمان خوارد، بـەجۆرێك کـە نەماندەویسـت هـەرگیز جـارێکی دی برسیمان ببێتەوە.

دایکم کە ئێمـەی بـەم خۆشـحاڵییە بینـی ڕووخسـاری گەشـایەوەو، خەندەیەکی شیرین کەوتە سەر لێوەکانی.

خانووەکە لە دوو ژوور پێکهاتبوو، تا بڵێیت بەشێوەیەکی ڕێکوپێك کەلوپەلەکانی تێدا دانرابوو.

دایکـم بـە دەنگـی بـەرز هەسـتی خۆشـحاڵی دەردەبـڕی و، دەیوت:"ئـای خوایـەگیان! چـەند میهرەبانیـت، سـەلاجە کۆنەکـەی خۆمان لە هەمان جۆرو، لەجێی قەنەفـەو تـاقمی ژووری نوسـتنەکەش لە هەمان شێوە مۆدێلی لێیە!".

واتـە وەك ئـەوەی کەلوپەلـەکانمان گوازرابێتـەوە بـۆ ئێـرە، ئـەم خـانووە، تەنانـەت وەك دووانـەی خـانووە کۆنەکـەمان دەهاتـە پـێش چـاو. بەسەرسـوڕمانەوە دەمانوت:"ئەمـە چـۆن دەبێـت؟ بەڕاسـتی

شـــتێکی ســــەیرە، دۆش دامـــابووین، بــــەڵام ڕووداوی لــــەوە سەرسوڕهێنەرتر لە دواتردا ڕوویدا.

پیرە پیاوێکی ڕیش سپی، کـە وا دیـاربوو خـاوەن ماڵەکەیـە، هاتـە ژوورەوەو، وتی:

– ئێوە کێن و، چی دەکەن لێرە؟

دایکم وتی:

– شۆفێری ئۆتۆمبێلێك ئێمەی هێنا بۆ ئێرەو، وتی لێرە نیشتەجێ بن، تەنانەت وتی ساحێب ماڵەکە کرێتان لێ وەرناگرێت.

پیاوە پیرەکە بە سەرسوڕمانەوە لە شوێنی خۆی دانیشت، وتی:

– ئای خوایە، خوایە گیان، من پیاوێکی وەها ناناسـم، دەمویسـت خانووەکەم بە کرێ بدەم، بەڵام بـەڵێنم بـە کـەس نـەدابوو. هـەروەها نیازیشم وەها نەبوو، کرێی وەرنەگرم.

ئێوە کێن؟ کەمێك باسی خۆتانم بۆ بکەن.

دایکم باسی کرد.

فرمێسك لەچاوی پیرە پیاوەکەوە داباری، دیاربوو ئەم بەسـەرهاتە جەرگبڕەمان کاری لەویش کردبوو.

– من ئەو پیاوەی ئێوەی هێناوەتـە ئێـرە ناناسـم، بـەڵام هـەزاران سوپاس بۆ پەروەردگارم کە خانووەکەی من بوو بە نسـیبی بێتـاوانی وەکو ئێـوە، کرێتـان لێ وەرنـاگرم و، هەرچـەندە مـن پیـاوێکی وەهـا

هـەبوو و دەوڵەمەنـدیش نـیم، بـەڵام ئینشـائەڵڵا ناوبـەناو یارمـەتی و هاوکاریتان دەکەم.

ئەم ڕووداوە کاریگەری زۆری هەم لەسەر دایکم و هەم لەسەر مامـە پیرەکەش جێهێشت، منیش دواتر کە پێگەیشتم بەهەمان شـێوە ئـەم ڕووداوە کاری تێکردم.

هەرچـۆنێك بێـت دەسـتێکی شـاراوە یارمـەتی پێشکەشـی ئێمـە دەکرد، تا لەم بێچارەییە بە هانامانەوە بێت. چۆن بتوانین ئـەو مامـە پـیرە نوورانییـە لـە یـاد بکـەین؟ کـە هـەرکاتێك بـێ ئومێـد بـووبێتین هاتووە بە هانامانەوە.

دایکم نەخۆشییەکەی هـەر سـەختتر دەبـوو، گـەورەترین ترسیشـی ئاسایشـی گیـانی ئێمـە بـوو، چـونکە دڵنیـابوو بـە گـەورەبوون و پێگەیشتنی سێ کوڕ، نە (حەمدیە شەل) و نە دوژمنەکانمان ڕێگـەیان نەدەدا هەرگیز ئاسوودەبین. هەروەها خـەیاڵی تۆڵەسـەندنەوەمان لـە دوژمنەکانمان ئۆقرەی لێبڕیبوون. واتە ئێمە هەم بەدەست تـەنهایی و برسێتی و، هەم بەدەست دوو دوژمنـی سـەختکارەوە گرفتـار بـووین.

ڕۆژانی زۆر بە ئازار، زۆر سەخت و دژوار و، زۆر بەدمان لەڕێدا بوو.

## منیان ڕفاند:

نەخۆشییەکەی دایکم گەیشتبووە ئاستێکی بەرگە نەگیراو. ئەو ساڵەی پێم نایە شەش ساڵیمەوە، ئەو برایەم کە لە من بچوکتر بوو پێنج و، ئەوەی دوای ئەو چوار و بچوکترین خوشکیشم سێ ساڵ بوو. هێواش هێواش هەستم بە بەرپرسیارییەتی سەختی ژیانم دەکرد، بۆیە پێویست بوو بیرێك لە کێشانی بەشێك لە خەرجی خێزانەکەم بکەمەوە. خاوەن ماڵەکەمان خوای گەورە تا ئەبەد لێی ڕازی بێت، هەم کرێی لە ئێمە وەرنەدەگرت و، هەم چاودێری ئێمەی دەکرد و دەستگیرۆیی دەکردین.

سندوقێکی بۆیاخی پێڵاوی بۆ من کڕی. سەرەڕای ئەو تەمەنە بچووکەم لە بەیانییەوە تا ئێوارە دەسوڕامەوە: سێ چوار قروشم دەستدەکەوت و، بە شەکەتی و ماندوویی دەگەڕامەوە ماڵەوە، بەڵام کە نرکەو ناڵەی دایکم گوێ لێ دەبوو، ماندوویەتیم لەبیر دەکردو، تا بەیانی نەدەنووستم و، فرمێسکم دەڕشت.

ئاخ!... ئاخ، چ ڕۆژگارێکی سەخت و پڕ دەردی سەری بوون، لەو ڕۆژانەدا دووچاری ڕووداوێکی وەها بووم، کە هەرکات بەبیرمدا دێتەوە، دادەچڵەکم.

وەك هەر ڕۆژێکی ئاسایی، بەیانییەکەی لەماڵ دەرچووم و، سندوقی بۆیاخەکەم دا بە کۆڵمدا. بە پێڵاوێکی کۆن و دڕاو و،

پانتۆڵێکی لە چل لاوە پینەکراو و، تیشێرتێکی شڕەوە پێستەکەشم ڕەنگی ڕەشی بۆیاخەکانی بواردبوو، نەخۆشییە بێ ئامانەکەی دایکم هەروەك هەموو شتێکی ماڵەوەی شێواندبوو ئێمەشی لە پاك و خاوێنی بێ بەش کردبوو.

لە نزیکی دیوارێکدا دانیشتم. بەو دەنگە بێچارەو غەم ئاوێزەوە هاوارم دەکرد: "وەرن با بۆیاختان بۆ بکەم کاکە، ئەگەر بریقەی نەدا پارە مەدە"، ئەو کەسانەی بەلامدا تێدەپەڕین کە سەیری جلوبەرگی چڵکن و سیمای ڕەشداگیرساویان دەکرد، هەندێکیان دڵیان بە تەمەن و حاڵم دەسوتا، هەندێکیشیان پێدەکەنین و تێدەپەڕین.

هەندێك جاریش کەسانی میهرەبان پارەی زیادەیان دەدامێ و، دڵیان خۆش دەکردم.

سەرنجی منیش لای ئەو منداڵانە بوو کە لە تەمەنی خۆمدا بوون. ئەوان، دایك و باوکیان دەستیان گرتبوون و، جلوبەرگی نوێ و جوانیان پۆشیبوو و، شیرینی و دۆندرمە بەدەستیانەوە بوو و، لە کەیفی خۆیاندا بوون...

بەجۆرێك ئیرەییم پێ دەبردن، کە ساڵانی منداڵیم بەو حەسرەتەوە تێپەڕین. کە ئێوارە داهات، کاتی گەڕانەوەش بۆ لای دایکی بێ چارەو دەردەدارم پەرێشانی دەکردم. بەڵام هەر لە ڕۆژێکی ئاسایی وەهادا ڕوداوێکی شومم بەسەردا هات.

پیاوێکی تەمەن مامناوەندی ڕێکپۆش لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا لێم نزیك بوونەوەو، کە نەمدەناسین، بەلاّم هێندە بە پەرۆشی و خۆشڕەفتاری لەگەڵمدا دوان، کە هەر زوو ئاشنایەتیمان پەیدا کرد، پرسیاریان لەبارەی ژیانمەوە لێ کردم. وتم:

– باوکم نەماوە، دایکیشم نەخۆشە، منیش چاودێری خوشکەکەم و دووبراکەم دەکەم.

–وتیان: بەڕاستی جێی داخە... زۆر بەداخەوە بووین بۆت. کەوابوو وەرە، لەپێشدا بەیەکەوە خواردنێکی باش دەخۆین، دواتریش دەمانەوێت لەبارەی چەند شتێکەوە لەگەڵتدا بدوێین.

هیچ بەرهەڵستیم نەکردن. هەرچەندە دایکم بەردەوام ئێمەی ئاگادار دەکردەوە:

– هیچ شتێك لەوانە وەرمەگرن کە نایانناسن. مەچن بۆ هیچ کوێ لەگەڵ کەسی نەناسراودا، لەوانەیە بەلاّیەکتان بەسەردا بهێنن.

بەلاّم ئەم دوو نەناسراوە هێندە میهرەبان دەهاتنە پێش چاو، کە هیچ ئاماژەیەکی دوژمنایەتیان تێدا بەدی نەدەکرا، سندوقی بۆیاخەکەمیان لێ سەندم و، منیان برد بۆلای ئۆتۆمبێلێك کە کەمێك لەپێشتر وەستێنرابوو. ئۆتۆمبێلەکە کەسێکی تریشی تێدابوو.

هەر کە چوومە ئۆتۆمبێلەکەوە، چاویان بەستمەوە. منیش دەستم کرد بە هاوارکردن، بۆیە دەمیان بەستمەوە، ئەوەندە ترسام کە

خەرکیببوو دڵم لە سینەم دەردەهات، عارەق بە سەراپای لەشمدا دەهاتە خوارەوە، تەنانەت لە ترساندا ژێر خۆمم تەڕکردبوو، هەر لەبەر ئەمەش یەکەم شەقم لەسەر تەڕکردنی ئۆتۆمبێلەکە خوارد.

## یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی مەرگ:

نازانم چەندێك ڕۆیشتن و، بۆ کوێ ڕۆیشتین، بەڵام کە چاویان کردمەوە، بینیم کە لە ژوورێکدام کە تیشکێکی ڕووناکی کز و مێزێکی کۆنی تێدایە.

دەستم کرد بە هاوار و پاڕانەوە.

– دایکم زۆر نەخۆشە، ئەگەر نەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە دایکم و خوشکەکەم و براکانم زۆر بێتاقەت دەبن. ئەگەر من نەبم، کەس نییە ئاگای لێیان بێت، توخوا مامەگیان وازم لێبێنن، خۆ من هیچم لە ئێوە نەکردووە.

دەستم برد لە گیرفانمدا، دەستکەوتی ئەو ڕۆژەم کە پارەی بۆیاخکردنی ئەو دوو پێڵاوە بوون، دەرم هێنا بەڕووی ئەو پیاوە ڕووگرژەدا کە لەبەرامبەرم دانیشتبوو درێژم کرد، وتم:

– بیگرە. هەر ئەمەم پێیە، هیچی تر شك نابەم.

زللەیەکی وەهای دا بەڕومدا، کە لە ناکاو خۆم لەسەر زەویەکە بینیەوەو، دەم و لوتم لە خوێنا سوور بوو بوو، نانێکی هەڵدایە بەردەستم. وتی:

– بگره، ئەمە بخۆ. دەنگیشت نەیەت و، هیچ خۆت ماندوو مەکە، تۆ بۆ ئێمە پێویستیت! پاشان چووە دەرەوە و ڕۆیشت.

لە خەیاڵی منداڵانەمدا هەزاران پرسیار دروست بوون: "بۆچی منیان هێناوە؟ چیان لەمن دەوێت؟ چی لەمن دەکەن؟"، ترس تەواوی بوونمی داگیرکردبوو لە ڕۆحمدا دەهات و دەچوو و، خەمی دایکم و خوشك و براکانیشم بەهیچ جۆرێك لە مێشکم دەرنەدەچوو...

لەلایەك ئەم هەموو کێشانە کە دەربازبوون لێیان ئەستەم بوو، ، لەلایەکی تریشەوە هەوڵم دەدا بە دەم و لێوی زامارەوە نانەکەی دەستم بخۆم.

برسێتی ئەوەندە زۆری بۆ هێنابووم، کە زۆری نەمابوو لە هۆش خۆم بچم، دڵنیا نەبووم چەندێك کات تێپەڕیوە کە بە دەنگی گفتوگۆی چەند پیاوێك ڕاچڵەکیم.

یەکێك لە پیاوەکان دەیوت:

– گوناهە، با واز لەم منداڵە بهێنین. ئەمە دایکی نەخۆشەو، باوکیشی نیە. نان پەیداکاری ماڵەوەشیانە، با ئەم کارە نەکەین.

ئەوەی تریشیان:

– باشیشە ئیتر ها، کەسیش لێی ناپرسێتەوە.

کەس نابێتە ڕێگرمان. چۆن بمانەوێت وای بەسەردێنین، ئەوەندە بەسە قاچێك و قۆڵێکی کەمئەندام بکەین و، چاوێکی کوێر بکەین.

بەمە بەتەواوی کەمئەندام و بێ دەسەلآت دەبێت. ئەم منداڵە پارەی زۆری بەنێو چاوانەوەیە. ئێوە تەنها ئەوە بکەن کە من دەیڵێم.

ئەم شەو کاری منداڵەکە تەواو بکەن، ئیتر دوای چەند مانگێك توانای کارکردنی دەبێت.

ئەی هاوار خوایە! گوێم لەچی دەبێت؟، واتە ئەوانەی منیان ڕفاندووە، باندی ڕفاندنی منداڵن و، دەیانەوێت کەمئەندامم بکەن، تا دواتر سواڵم پێ بکەن، ها؟!

دەنگم بەهیچ پەنایەك ڕانەدەگەیشت، تەنها وەك ئەوەی لە دایکم بیستبووم، دەپاڕامەوە. "پەروەردگارم یارمەتیم بدە، لێرە ڕزگارم بکە، فریام بکەوە، دەمەوێت بچمەوە بۆ لای دایکم".

بەهەر حاڵ، بەدڵی منداڵانەوە زۆر لەناخەوە دوعام کردو، لەو ساتەدا ڕووداوێکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕوویدا، کە تا ئێستەش لەژێر کاریگەری جۆش و خرۆش و پەرۆشیی ساتی ڕوودانیدام. بەڕاستی ئەم بیرەوەرییە پیرۆزترین و بەنرخترین نهێنی ژیانی منە.

## جارێکی دیکە ئەو پیرە پیاوە نوورانییە!

دەرگاکە کرایەوە. منیش وا گومانم برد کە جارێکی دیکە ئەو پیاوانە هاتنە ژوورەوە، بۆیە سەرم خستە نێوان دەستەکانمەوە، بەخەیاڵی ئەوەی لێم دەدەن، ویستم بەدەستم سەرم بپارێزم. بەڕاستی ترس و دڵەڕاوکێی ئەوساتە لە باسکردن نایەت.

کەسێك بە هێواشی لێم نزیك بوویەوەو، زۆر میهرەبانانە دەستی خستە سەرشانم و وتی:

– مەترسە، من لەوان نیم.

کاتێك سەرم بەرزکردەوە، چی ببینم!؟ ئای خوایە گیان، ئەو ڕووخسارە میهرەبانە، ئەو خەندە ئاسوودەبەخشە، ئەو دوو چاوە پڕ لە سۆزو بەزەییە.. لەساتێکدا منی بەرەو دونیا مەزنەکەی خۆی پەلکێش کرد. ئەمەم وەك خەیاڵێك دەهاتە پێش چاو و، بێ دەنگ لە پیرە پیاوەکەم دەڕوانی، قۆڵمی گرت وتی:

– دەی بابڕۆین، دایك و خوشك و براکانت چاوەڕێی تۆن.

دەرگاکەی کردەوەو چووە دەرەوە، منیش بەدوایدا چوومە دەرەوە، لەو نێوەندەدا هیچ کەس دیار نەبوو و، بینیم لە خانوویەکی وەك ڤێلادا بووم. سواری ئۆتۆمبێلێك بووین و، کاتیش شەو بوو. زۆر بە خێرایی هاتینەوە بۆ ماڵەوەو، منی دابەزاند.

تەنها توانیم بڵێم: مامە ئێوە کێن؟

ڕووخساری بە خەندەیەك گەشایەوەو وتی:

– "زووکە ئێستا بچۆ بۆلای دایکت. دواتر یەکتر دەبینینەوە".

منیش دابەزیم و، ئەویش ئۆتۆمبێلەکەی لێخوڕی، ڕۆیشت.

– دایکی داماو و خوشك و براکانم زۆر خەمی منیان بوو و، زۆر ترسابوون. دایکم هەر کە منی دی و، لە ئامێزی گرتم و، فرمێسك لە

چاوەکانییەوە داباریین.. گریا گریا... کە ڕووداوەکەم بۆ گێڕانەوە، دایکم ئاسوودە بوو و، دوعای کرد:"واتە ئەو پیاوە ها! ئای خوایە گیان، زۆر شوکر. چەندە لێت بپاڕێینەوە کەمە".

بە لوتفی پەروەرگار بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە بەلایەکی تریش ڕزگارمان بوو. سەختی و نەهامەتییەکانی ژیان کۆتایی نایەن و، یەك لەدوای یەك بەسەرماندا دادەبارێن.

## ساڵانی پڕ ناسۆری خوێندنی سەرەتایم:

هەر ڕۆژێك کە تێدەپەڕی ڕۆژەکەی پێشوتری لا شیرین دەکردین، لەگەڵ سەختی و ناهەمواریيەکانی ژیاندا لە ڕووبەڕووبوونەوەی بەردەوامدا بووین، لە هەموو کەس زیاتر گرفتارو بێچارە بوو بووین. بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار تەنهایی و، بێکەسیی و، هەژاری و، بێچارەییش وێنای ژیانی ئێمەیان دەکرد.

شەوە ئەنگوستە چاوەکانیش یەك لەدوای یەك دادەهاتن و، لەژێر فشاری ئازارەکاندا ئێمەیان وردو خاش دەکرد.

ئاخ، ئەو شەوانە! خۆزگە نەهاتبان و، نرکەو ناڵەی جەرگبڕی دایکم بەرگوێ نەکەوتایە...

خۆزگە شەوێك، تەنها شەوێك، بە ئاسوودەیی و دوور لە ئازارو ناڵە ڕاکشایەوە، بێ هاوارکردن و، چنگ گیرکردن لە جلەکانی، بەبێ وتنی:"تخوا ڕزگارم کەن، وا ئەمرم"، گەر تەنها بۆ شەوێکیش بوو،

بەڵام ئێمە شەوی لەو جۆرەمان نەدی و، هەندێ جار حاڵی
ڕۆژەکانمان زۆر لەشەوەکان خراپتربوون، چونکە جارجار بە تەنهاو،
هەندێك جاریش لەگەڵ یەکێك لە براکانمدا و، هەندێك جاریش خۆم و
دوو براکەم، هەر کە لە خەو هەڵدەستاین، بە سندوقێکی بۆیاخەوە
لەم جادە بۆ ئەو جادە دچووین بەدوای پاروە نانێکدا.

برسی و، تینوو، بە شەقامەکاندا دەسوڕاینەوە، ئەمە جگە لە
بێچارەیی و بێ دەرەتانیی چی پێدەوترێت؟. هەندێ جار پارەی یەك
دوو نانێکمان دەست دەکەوت، بێگومان ڕۆژی واش هەبوو کە هیچمان
قازانج نەدەکرد. بەڵام تاڵترین ڕاستی ژیانمان هەستکردن بوو بە بێ
سەرپەرشتیاری، پەراوێزخراوی و، بێنازی و، خەیاڵی خراپی تەنیایی،
هەمیشە پەند وەرگرتن لە ڕەفتاری خراپ و هەڵەکانمان قەدەری ئێمە
بوو. یەکەم جار تاقیکردنەوەی جگەرەو، دزی بەشێك بوون لە یارییە
منداڵانەکانمان. ڕووکاری ژیانی داهاتوومان بە زنجیرەیەك ڕووداوی
سەرسوڕهێنەرو چاوەڕواننەکراو چنرابوو.

بێ خاوەنی، نەبوونی خەمخۆرێك بۆ داهاتوومان چەشت. لە
گێژاوی ژیانێکی سەرتاپا بۆش و پووچدا سەرگەردان بووبووین.
لەخوێندنگەی سەرەتایی بووین.. پەروەردگارم هەزاران جار لێ ی
ڕازی بێت.. مامە پیرەی خاوەن ماڵمان پێویستیەکانی مەکتەبی

هەموومانی دابین دەکرد. وەك بلێی ئەو باوکێکی مەعنەوی ئێمە بوو و، وەك خزمێکی زۆر نزیك، هەمیشە دەستگیرۆیی دەکردین.

من لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، یەکێك لە براکانیشم لە چوار، ئەوی تریشیان دەرچووبوو بۆ چوار. خوشکە بچووکەکەشمان لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بوو. هەرچوارمان ئاستی خوێندنمان زۆر باش بوو. هەرچواریشمان زیرەکترینی پۆلەکەمان بووین. بێگومان ئەمەش بە هاندانی دایکی ڕەحمەتیم و، مامەپیرەی خاوەن ماڵ و مامۆستاکانمان.

خوشکە بچووکەکەم مامۆستایەکی زۆر میهرەبانی هەبوو بەناوی (ئایلا) خان، کە گرنگی بە ئێمە دەداو، لەهەر دەرفەتێکدا ئێمەی کۆدەکردەوە و، ئامۆژگاری دەکردین:"لەسەرکەوتن زیاتر هیچ چارەیەکی ترتان نییە، ڕێگەی ڕزگاربوونتان و، بەردەوامیدانتان بە ژیانێکی باش تەنها خوێندنە. پێویستە لە هەموو کەسێك زیاتر هەوڵ بدەن و بخوێنن. ئەو کاتە دەتوانن تەنانەت نەخۆشیەکەی دایکیشتان چارەسەر بکەن. دەبنە خاوەن ماڵی خۆتان و، پارەو سامانتان دەبێت، سەیارەش بۆخۆتان دەکڕن".

سەلامەت بێت (ئایلا) خان... بە باشی لە دونیای منداڵیمان تێدەگەیشت، زۆر بەباشیی ئێمەی ئاراستە دەکرد، بەلام

سەختییەکانی ژیان بواریان نەدەداین بە ئاسوودەیی بەردەوامیی بە خوێندنەکەمان بدەین.

من هەستم بە بەرپرسیاریەتییەکی زۆر دەکرد. لە ئاستی کەسانی لەخۆم گەورەتردا ڕەفتارم دەکرد. حاڵی دایکم، بژێوی ژیانمان، دوژمنەکانمان، پارێزگاری لە خوشك و براکانم و چەندین خەیاڵی تر، لەو گرفت و کێشانە بوون کە بەردەوام سەرقاڵیان کردبووم.

هەندێك جار بە تووڕەیی و کینە لە دڵییەوە دەمویست بەیەك زەبر دوژمنەکانمان لەناو بەرم و، خەیاڵی سەربڕینی هەموویان و هەڵواسینیان بەدیواردا، ئارامییەکی لە ڕادەبەدەری پێ دەبەخشیم.

هەندێك جار دەچوومە گۆشەیەکەوە و دەگریام، زۆر بەباشی بیرم دێتەوە هەرکاتێك هەستم بە بێچارەیی دەکرد بە گریان ئاسوودە دەبووم. هەندێك جاریش کە هاوتەمەنەکانی خۆم دەبینی گوزەرانیان باشە و جلوبەرگیان ڕێکوپێکە، ئیرەیی تووشی سەرپێچی دەکردم و، دەموت:"پەروەردگارم، بۆچی حاڵی ئەوان باشە، دایك و باوکیان تەندروستن، بۆیاخی قۆنەرەش ناکەن، ئێمەش بەم جۆرە پەرێشانین؟".

بەڵام دواتر کە پیرە پیاوە نوورانییەکەم دەهاتەوە یاد، دڵنەوایی خۆمم دەدایەوە، چونکە کە دەکەوتینە تەنگانەو دژواری و سەختی ژیان ئەو دەهات و دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکردین.

دایکی ڕەحمەتیم زوو زوو ئێمەی ئاگادار دەکردەوە و، دەیوت: "ئاممان، لای کەس هیچ شتێك لەبارەی ئەم پیاوەوە نەدرکێنن. ئەو بەندەیەکی زۆر باشی پەروەردگارەو، یارمەتی ئێمە دەدات، ئەگەر ئەمە بۆ کەسانی تر باس بکەن، جارێکی تر نایەتەوە".

بەڵێ ئەو بەندەیەکی باشی خوا بوو، بەڵام کێ بوو؟ چ کارە بوو؟ بۆچی یارمەتی ئێمەی دەدا؟ بۆچی زۆر کەم قسەی دەکرد؟ ئەو پیاوە نوورانییە لە خەڵکی ئەم دونیایە نەدەچوو. باشە، لەکوێوە دەهات؟ هەموو ئەمانە و پرسیاری وەك ئەمانە، هەموو ساتێك لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون و، بە بێوەلام لەسەرسوڕماندا دەیهێشتمەوە.

# بەشی سێیەم

## برایەکمیان کردە قوربانیی

## ڕووداوێکی هاتووچۆ



من قۆناغی خوێندنی سەرەتایم تەواو کردبوو. براکانم یەکێکیان دەرچووبوو بۆ پێنج و ئەوی تریان چوار و، خوشکە بچووکەکەشمان سێ. خۆم و ئەو برایەکم کە لە پۆلی چواربوو بەیەکەوە چووین بۆ ئیش. من پێڵاوم بۆیاخ دەکرد. ئەویش لەتەنیشتمەوە تەل و ئاسنی کۆنی دەفرۆشت. شوێنەکەمان نزیکی پارکێك بوو، ئێمەش لەسەر شەقامێکی سەرەکی کارمان دەکرد، لەنێوان پارکەکە و شەقامەکەشدا شۆستە نەبوو.

من سندوقی بۆیاخەکەم بۆ براکەم بەجێهێشت و، چووم بۆ ئەو تەوالێتەی کە لەو ناوەوە نزیك بوو و، دە خولەك یاخود چارەکێکم پێ چوو، کە گەڕامەوە چی ببینم! ئەو شوێنەی ئێمەی

لێدانیشتبووین خەڵکێکی زۆری لێکۆبوونەتەوە و قەرەباڵغییەکی زۆریان نابوویەوەو، هەندێك کەسی تریش بەرەو ئەوێ ڕایان دەکرد.

کاتێك دیمەنەکەم بینی، وەك ئەوەی خۆم دووچاری ڕووداوەکە هاتبێتم، ناخم هەڵقرچا. بە ترس و دڵەڕاوکێوە خۆم گەیاندە ناو ئاپۆرەی قەرەباڵغیەکەوە، بینیم وا لاشەی خوێناوی براکەم لەسەر شەقامەکە کەوتووە و، کەلوپەلەکانی لەو ناوەدا پەرش و بڵاوبووبوویەوە و، سندوقی بۆیاخەکەشی تێکشکابوو. بەبێ تێگەیشتن لە ڕووداوەکە خۆم دا بەسەر لاشەی خوێناوی براکەمدا.

خەڵکی ئەو ناوە هەوڵیان دەدا لە لاشەکەی دوورم بخەنەوە، بەلام من هاوارم دەکردو دەموت:"بەرمدەن، ئەوە برای منە".

ئای چ بێچارەیی و بێکەسییەك بوو، دیارە گرفتەکانی ڕابردووم بە بەراورد بەمە هیچ نەبوون. خەڵکەکە هاواریان دەکرد"با بیبەین بۆ نەخۆشخانە، منداڵەکە هێشتا زیندووە، هەناسە دەدات!".

بەلام لەو کاتەدا ئۆتۆمبێلێکمان بۆ پەیدا نەکرا، تا بیگوازینەوە بۆ نەخۆشخانە. زۆری نەخایاند، براکەم کە هێشتا لە دە ساڵی تەمەنیدا بوو، چرۆی تەمەنی هەڵوەری. ڕەنگە لە چەشتنی ئازارە هەرە سەختەکان ڕزگاری بووبێت. برا داماوەکەم چەند لیرەیەکی لەدەستدا بوو کەمرد، چەند لیرەکەمان بە زۆر لە دەستی دەرکرد هێندە توند دەستی نوقاندبوو، چونکە ئەوە پارەی پاروە نانەکەمان بوو. بەلام

شێوەی ڕووداني ڕووداوەکە، چەند هێنـدە زیـاتر کینەلـەدڵی کـردم و، نـاخم بـە خـەیاڵی تۆڵەسـەندنەوە کڵپـەی سـەند، هـەر لـەو ساتەشـدا بڕیاری خۆم دا.

"هەموو دوژمنەکانم یەك یەك لەناو دەبەم" چیتر لە مـەرگیش سڵم نەدەکردەوە، چونکە ئاگرەکەی ناخم بەشـێوەیەك کڵپـەی سـەندبوو، کـە هـیچ ئـارامی و دان بـەخۆداگرتنێك دادی نـەدەدام لـە ئاسـت لەناوبردنی سەراپای دوژمنـەکانمان. بـەپێی گێڕانـەوەی خـەڵکی ئـەو ناوە بۆ ڕووداوەکە: تەکسـیەکی جـۆری (فـۆرد) لـە منداڵەکـەی داوە، دواتریش بەبێ وەستان بۆی دەرچووە، لەکاتێکدا ئەو شـوێنەی ئێمـە کارمــان لێــی دەکــرد زۆر ســەرەڕێگا نــەبوو، بــەڵام لەبەرئــەوەی شەقامەکە شۆستەی نەبوو، تەکسیەکە توانیبـووی بـە ئاسـانی خـۆی دەرباز بکات.

لەونێوەندەدا زۆر بـە ئاشـکرا دیـار بـوو کـە ڕووداوەکـە بەدەسـتی ئەنقەست بووە، لەڕاستیدا ئەو ناپاکـە، ئـەو پیـاوکوژە بـێ ویژدانانـە هەردوکمانیان بەیەکەوە کردۆتە ئامانج، بەڵام لەبەرئەوەی لەو ساتەدا مـن لـەوێ نـەبووم، تــەنها براکـەم بـووە قوربـانیی و چـرۆی تەمـەنی هەڵوەری.

لەگـەڵ براکەمـدا یـەکتریمان زۆر خۆشەویسـت، هـەرگیز لـە یـەکتر جیانەدەبووینــەوە. چــەندین جــار بەیەکــەوە گریــاوین، بەیەکــەوە

برسیبووین و، لەسەر دەستی کەسی ناپاك و خراپەکاری شەقامەکان لێدان و ئازارمان خواردووە. تەمەنی منداڵی ئەویش وەك من بە دەردی سەری بوو.

بە ئاشکرا دیاربوو ئەوانەی زۆر دڕندانە براکەمیان ئاراستەی مەرگ کرد. لەبەرئەوەی پێنەگەین و، نەبینە دڕکی سەر ڕێیان، هەر لە منداڵییەوە لەناوبردنیان گرتبویە بەر. ئەمانە یان دوژمنە کۆنەکانمان، یاخود پیاوەکانی حەمدیە شال بوون، هەر ئەوانەی کە باوکمیان بەشێوەیەکی دڕندانە کوشتبوو. دڵنیابووم کە هەردوولایان هەرگیز ڕێگەیان نەدەدا گەورە ببین و، پێ بگەین، تا لاپەڕەی کۆن هەڵبدەینەوەو بەدووی هۆکاری ڕاستەقینەی کوشتنی باوکمدا بچین، واتە من و خوشك و براکەی تریشم دەبوو لە چاوەڕوانی هەمان چارەنووسدا بووینایە. چونکە دڵنیابووین کە بۆ کۆتایی هێنان بە خێزانەکەمان کەمتەرخەمی ناکەن و، سڵ ناکەنەوە.

ئاخ، دایە گیان ئاخ!

## ڕووخانی دایکم:

لاشەی ساردوسڕی براکەمیان بردبوویەوە بۆماڵەوە، کە لە دڕندانەیی دیمەنەکەو بێ بەزەیی کوشتنیدا لە هەمان شێوە کوشتنەکەی باوکم دەچوو. خۆڕاگریی لە ئاست ئازارێکی لەم جۆرە

زۆر ئەستەم بوو، بەڕاستی لە سەختی غەمێکی وەهادا هیچ شتێك دڵنەوایی ئێمەی نەدەکرد.

ئاخ، دایکە گیان ئاخ!... چەندە پەرێشان بوو، بە هیچ جۆرێك سەبووریی نەدەهات. ئەم ڕووداوە بەتەواوی لەناوی برد، لە کۆتاییدا لەهۆش خۆی چوو. هێشتا هاوارەکانی دایکم و نرکەو ناڵەی جەرگبڕانەی لە ناخمدا دەبیستم، بەهۆی لەخۆدانیەوە چەندین جار لە هۆش خۆی چوو بوو، لەناو ئەو هاوارو لاڵانەوەی دایکم -کە وەك دارێکی وشك دەسوتا- ئێمەش شیوەنمان دەکرد، بەتایبەتیش خوشکە بچوکەکەم، کە نەیاندەتوانی بە هیچ شێوەیەك لە لاشەی براکەمی جیا بکەنەوە.

ئەو شەوە لەماڵەکەماندا تەنها لاشەی برا بێتاوان کوژراوەکەم و، دایکی دەردەدارم و، سێ منداڵی بێتاوانی بێچارە هەبوون. ئەمە بەتەواوی جۆرە قیامەتێك بوو.

جگە لە مامەپیرەی خاوەن ماڵ، یەك بەندەی خودا دەرگامانی نەکردەوە تا ببێتە هاوبەشی خەممان، کەسمان نەبوو دڵنەواییمان بکات، یارمەتیمان بدات، لەناو دڵی ئەو شارە گەورەو فراوانەدا بێ کەس بە ئازارەوە دەتلاینەوە. هەستی یاخی بوون و کینەو کڵپەی تۆڵەسەندنەوەی ناخم لەباسکردن نایەن. چیمان لەدەست دەهات پەروەردگارم؟ ئای چەند بێچارە بووین!

لەلایەك دایكم لە لێواری مەرگدا بوو. لەلایەكی ترەوە لاشەی بچووكی برا بێتاوانەكەم، سەرەڕای كڕوزانەوەی خوشك و برا دڵشكاوەكەم.. دوعام دەكرد"خودایە، هیچ پەنایەك شك نابەین، یارمەتیمان بدە، بێچارە بووین".

لەدڵە بچوكەكەمدا، لەلایەك ئاگری تۆڵەسەندنەوە كڵپەی سەندبوو، لەلایەكی تریشەوە لە خوای گەورە دەپاڕامەوە بەهانامانەوە بێت.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك لەشیوەنی ئێمە بەسەر لاشەی براكەمدا، لە دەرگا درا، خاوەن ماڵەكەمان هاتە ژوورەوەو بەدواشیدا ئەو پیاوە...

بەڵێ، ئەو پیاوە نوورانییە جارێكی تریش دەركەوتەوە، لە سەختترین و تاڵترین ساتەكاندا ئێمەی بەسەر دەكردەوە...

بە هاتنە ژوورەوەی ئەو پیاوە خۆری هیوایەك لە ماڵەكەماندا هەڵهات و، بۆ ساتێك فێنكی بە سینەی گڕگرتووماندا هێنا.

سیمایەكی گەشاوەو، میهرەبانییەكی سەرسوڕهێنەر لە ڕووخساریدا دەخوێندرایەوە، كە ئاسوودەیی بەناخی مرۆڤ دەبەخشی، هەموو هەورەكانی غەم و پەژارەی ڕەواندەوە، دایكی ڕەحمەتیم كە چاوی بەم پیاوە نوورانییە كەوت، هەستاو ڕێی پیشاندا. وەك ئەوەی بە ساتێك وزەو توانا كرایەوە بە لاشەی دایكی دەردەدارمدا.

دانەنیشت هەر بە ڕاوەستاوی لە ئێمەی دەڕوانی و وتی:

"بێتاقەت مەبن، منداڵەکەتان ئێستە لە بەهەشتدایە، ئاخیرەتی خۆی مسۆگەر کرد، لەوانەبوو لەم دونیادا سەدان ساڵ پەرستشی بکردایە ئەم مەقامەی دەست نەکەوتایە. ئێستا ئەو لە خۆشترین و بەختیاریترین ساتەکانیدا دەژی. دەبێت بە شەفاعەتکار بۆ ئێوەش".

قەدەری خوای گەورە هەزاران حیکمەت لەخۆ دەگرێت و، ئەو هەرگیز ستەم لە بەندەکانی ناکات. سەرەنجامی ڕووداوێك کە بە ڕواڵەت خراپ و زیانبەخش دیارە زۆر بەخێر دەگوزەرێنێت.

یاخی مەبن و، سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە مەکەن، ئارامگر و سوپاسگوزار بن، تەنها پشت بەو زاتە ببەستن و، هانای بۆ بەرن، چونکە لە دونیاو قیامەتدا مەزنترین پاداشت دەبەخشێتە ئەو بەندانەی هانای بۆ دەبەن.

نەکەن لە هەراسانیدا بڵێن: ئێمە تەنهاین، پەروەردگار مەزنترین دۆستی ئێوەیە، فریشتەکانیش باشترین هاوڕێتانن و، ئایا دەسمایەو سامانێك هەیە لەمە زۆرتر بێت؟.

بە میهرەبانی دەستی هێنا بەسەرمدا، منیش بەمە هێوربوومەوەو ئارامییەکی سەرسوڕهێنەر باڵی کێشا بەسەر دەروونمداو، پاشان ڕۆشتە دەرەوە.

ئێمە بە دۆشداماویی ڕاوەستابووین، پاشان ساحێب خانووەکە هات و پرسیی:

– ئەم زاتە کێیە؟

دایکم وتی:

– خۆ ئەو دووانەتان بەیەکەوە هاتنە ژوورەوە.

– نەخێر، من نایناسم. لەبەردەمماڵەکەدا پرسیاری ئێوەی کرد، منیش هێنام بۆ ئێرە.

– ئەوە ئەو پیاوە بوو کە یەکەمجار ئێمەی هێنا بۆ ئێرە.

ئەوە خۆی بوو...

خاوەن ماڵەکەمان لە پڕ وەك ئەوەی ڕاستییەکی بۆ دەرکەوتبێت وتی:

– خۆم هەستم پێ کردبوو، زانیم ئەمە پیاوێکی هەروا ئاسایی نییە، ئێ!... پەروەردگار هەمیشە فریادڕەسێك بۆ بەندە گرفتارو بێچارەکانی ڕەوانە دەکات. ئێمە ئەوەندەمان بەسە کە لە بەندایەتی کردنیدا کەمتەرخەمی نەکەین.

ئەو پیاوە فێنکاییی بەسەر سینەی پڕ ئاه و حەسرەتماندا باراند و، کەمێك هاتینەوە سەر خۆمان. ڕۆژی دواتر براکەمیان ناشت. خاوەن ماڵەکەمان–لەش ساغ بێت– هەموو شتێکی ئامادە کردبوو.

لەپاش ئەمە مەزاری براکەم، ئەو شوێنە بوو کە من زۆرترین جار سەردانم دەکردو، لەهەر سەردانێکیشدا سوێندم دەخوارد:"دەبێت تۆڵەی تۆ بکەمەوە، دڵنیابە یان ئەوەتا تۆڵەی تۆیان لێ دەسێنمەوە، یاخود لەم پێناوەدا دەمردم".

## ڕێیان نەدەدا ساتێکیش ئاسوودەبین:

هەڵهاتنی خۆری هەر ڕۆژێك چەرمەسەرییەکی نوێمان دەبینی و، کە ئاواش دەبوو، دەردی سەرییەکی تر لەڕێماندا بوو.

من و برا بچووکەکەم خوێندنی خوێنگەکەمان تەواوکرد، دوو ساڵ پێکەوە ئاسنە کۆنمان فرۆشت، پێڵاومان بۆیاخ کرد. خوشکە بچووکەکەشمان خوێندنی تەواو کرد.

لەم ماوەیەدا جارێك ماڵەکەمان سوتا، دایکم زۆر بەسەختی لە مردن ڕزگاری بوو. خۆ لەماڵەکەدا کەلوپەلێکی وەهای تێدا نەبوو، بەلام ئەو کەمەشی کە تێیدابوو سوتان. بێگومان ئەم جارەش دوژمنەکانمان بوون، کە ئەم بەلایەشیان بەسەردا هێناین، جارێك خاوەن ماڵەکەمان خوای گەورە هەزاران جار لێی ڕازی بێت، هات بە هانامانەوەو ماڵەکەی نۆژەن کردەوە، هەندێ کەلوپەلی کۆنی بۆ پەیدا کردین و، جارێکی تریش لە بێلانەیی ڕزگاری کردین.

چەند جارێك سەیارە لێیدان، جارێکیش ژەهراوی کراین، واتە مەرگ دەورو خولی دەدایەن، دوژمنەکانمان بۆ ئەوەی بەتەواوی

لەناومان بەرن، ئەوەی لەدەستیان بهاتایە درێغیان نەدەکرد. ئێمەش پێگەیشتبووین و، هەستمان بە هەموو شتێك دەکرد. من چەکێك و، خوشك و براکەشم چەقۆیان هەڵدەگرت. واتە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەستمان کردبوو بە پەیڕەوکردنی یاساکانی سەر شەقام.

هەر لەم نێوەندەشدا خومان بە مەی خواردنەوە و جگەرەکێشانەوە دەگرت. ئەم حاڵەمان بەرەو لادانی ڕەوشتیی سەری دەکێشا، ژیانی بێگەرد و خاوێنمان، خەریك بوو ئاوێزانی ناپاکیی و بەدکاری کوچەو کۆڵانەکان دەبوو، چارەنووسمان بەرەو هەڵدێر دەچوو.

## کەمئەندام بووم:

بێگومان کەسانی دەورمان تەنها خراپەکاران نەبوون، بەڵکو پەروەردگار کەسانی باشیشی دەهێنایە سەر ڕێمان و ، پێیانی ئاشنا دەکردین، لەناو ئەمانەدا کەسایەتی زۆر بەڕێزو چاکەخوازیشیان تێدابوو، کە هەوڵیان دەدا تا بتوانن یارمەتیمان بدەن. ئەو ساڵەی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم تەواوکرد، من و خوشك و براکەمیان سپاردە بەشی پەروەردەکردنی ناوخۆیی، بەڵام نەمانتوانی لەوێدا ئۆقرە بگرین، چونکە دایکم نەخۆش بوو و، ئێمەش نەماندەتوانی دوور لە دایکمان بەردەوامی بە ژیانمان بدەین، منداڵ بووین و، هاروهاجیمان دەکرد، منیش لە ڕووداوێکی دزیکردن لە بەشە

ناوخۆییەکەدا تێوەگلابووم، بۆیە ئەوە بووە بەهانەو، ئێمەیان لەوێ دەرکرد.

هەروەها کەسانێك کە لەژێر پەردەی یارمەتیدانەوە لێمان نزیك دەبوونەوە، بەڵام دواتر کەسانی نیاز خراپ دەرەچوون، چەندجار ویستیان ئێمە لە ئامانجە چەپەڵەکانیاندا بەکاربهێنن، هاتن بۆ ماڵەوەمان و ویستیان بە ڕێگەی هەڵەدا ئاڕاستەمان بکەن، مرۆڤی ناپاك کە ببینێت کەسێك لە کۆمەڵگەدا تەنیاو بێچارەیە دەستبەجێ هەوڵی لە خشتەبردنی دەدات.

دوو براو خوشکێك، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەختییەکانی ژیان لە سەنگەردا بووین، خوشکەکەم، لەماڵەوە چاودێری دایکمی دەکرد، منیش لەگەڵ براکەمدا لە هەوڵی پەیداکردنی بژێوی ژیاندا بووین.

هەر لەو ڕۆژگارەشدا هێواش هێواش هەنگاومان بەرەو قۆناغی هەرزەکاریی دەناو، خوازیاربووین بوونی خۆمان بسەلمێنین. من و براکەم دووبەدوو سەرمان لە شەڕکردن دەخوراو، تا دەهات بەرچاوڕوونیمان سەبارەت بەم جیهانە زیاتر دەبوو و، هەمیشە دەترساین بەڵایەکمان بەسەر بێنن.

بەیانیان بە چەکەوە دەڕۆیشتین بۆ ئیش، واتە هەم پێمان وابوو بەمە خۆمان لە دوژمنەکانمان دەپارێزین، هەم دەمانویست لە کەشوهەوای هەرزەکاریی و گەنجێتیدا بژین.

هەرچۆنێك بوو ئۆتۆمبێلێكی بچووكمان پەیدا كرد، كە بۆ فرۆشتنی خواردنی بۆرەك و شیرینی بەكاردەهێنرا، ئێمەش جارجارە پێی دەسوڕاینەوە و، ئەو شتانەمان دەفرۆشت، لەبەرئەوەی یارمەتی یەك بدەین و، یەكتریش بپارێزین، بۆیە بەجیا ئیشمان نەدەكرد و، هەمیشە پێكەوەبووین.

ئەو بەیانییەش پێكەوە لە لاتەنیشتی شەقامەكەدا ئۆتۆمبێلەكەمان لێدەخوڕی، لەلایەكیشەوە هاوارمان دەكرد:"بۆرەك دەفرۆشین! شیرینیمان لایە" لەبەرئەوەی لە لێواری لای ڕاستی شەقامەكەوە ڕێمان دەكرد، بۆیە نەماندەتوانی ئەو ئۆتۆمبێلانەی لەدواوە دەهاتن ببینین، بەڵام نەوەك لەساتێكدا دووچاری پێكدادان ببین بەردەوام چاودێری پاش خۆمان دەكرد، بەڵام وادیارە باش نەمانتوانیبوو چاودێری بكەین. هەر ئەوەندەم لەیادە.

كە هاوارێكم گوێ لێبوو و، هێزێك منی بۆ زۆر دوور هەڵدا. لەیادم نییە پاش ئەمە چی ڕوویدا، بەڵام كە چاوم كردەوە، خۆم لە بەشی فریاكەوتنی نەخۆشخانەیەكدا بینییەوەو، براكەشم بەرامبەرم وەستابوو، هەردوو چاویی باران ئاسا فرمێسك دەباری و، هاواری دەكرد:"كاكە گیان، چاوت بكەوە، كاكە"، كە بینیم ئەو سەلامەتە زۆر بە ئەستەم وتم:"سوپاس بۆ خوا" و باوەشمان كرد بەیەكدا. دیاربوو براكەم لەم نێوەندەدا خوا پاراستوویەتی، هەزاران جار شكور

بۆ خوا، كه ڕزگارمان بوو. بێگومان ئۆتۆمبێله نازدارەکەشمان، که به هەزارو یەك دەردی سەری پەیدامان کردبوو، پارچه پارچه بووبوو.

ئێمه نەمانتوانی ئۆتۆمبێلەكەی پێشەوەمان ببینین، بەڵام بەپێی قسەی ئەوانەی که بینیبوویان: بێگومان هەر ئەوان بوون... یان دوژمنە کۆنەکانمان، یاخود بەکرێگیراوانی حەمدیەل...لاپەڕەیەکی نوێ لە ڕۆژانی پڕ ناسۆری دەستیپێکرد.

پزیشکەکان چارەسەری پێویستی برینەکانیان نەکردبووم، بۆیە بۆ ماوەیەکی درێژ برینەکانی قاچم سارێژ نەبوون، لەکۆتاییشدا قاچی چەپم لەکارکەوت کەم ئەندام کەوتم. داخ و پەژارەی کەمئەندام بوونی گەنجێك تەنها ئەو کەسە دەیزانێت کە خۆی چەشتبێتی، هێندە بارقورسییەکی گەورە بوو، کە لە باسکردن نایەت. کەمئەندامبوونی گەنجێك کە چرۆی تەمەنی تازە خونچە دەکات، مرۆڤ زۆر بێتاقەت دەکات...

لەو ساڵانەدا هەموو هیواو باوەڕێکمان بەرامبەر مرۆڤەکان بەتەواوی لەدەست دابوو، ئێمە تەنها دوو دۆستمان شك دەبرد. یەکەمیان خاوەن ماڵە پیرەکەمان، ئەویش پیاوێکی نەخۆش بوو و، لەپێناو سەلامەتیدا بەردەوام لەخوای گەورە دەپاڕاینەوە، چونکە دڵنیابووین ئەو ساتەی بەڵایەك بەسەر ئەو دێت، دەستبەجێ بێ لانە دەبین.

دووەمیشیان پیرە پیاوە نوورانییەکە بوو، کە لە دژوارترین ساتەکانی ژیانماندا بەهانامانەوە دەهات، بەڕاستی هێندەی سوپایەك وزەو ورەو توانای دەبخشییەوە ئێمە، ئەو گریمانەو مەتەڵە بوو کە بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی شیکاری بکەم و لێی تێبگەم. دایکم هەندێ شتی دیکەی دەزانی، بەڵام بە ئێمەی نەدەوت. دڵنیاش بووم پەروەردگار دەستبەرداری بەندەی وەك ئێمە نامۆو بێکەس و بێچارە نابێت. یارمەتیدانی ئەو پیاوەش بەشێك بوو لە تیشکی میهرو بەخشندەیی زاتی موبارەکی خۆی، بەڵام بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەموو دوژمنایەتی و سوکایەتی پێکردن و دەردی سەرییەش زۆر سەخت و ئەستەم بوو.

تووڕەیی و کینە لەدڵیی و ئاگری تۆڵەسەندنەوەی ناخمان بەرەو هەڵدێر ئاڕاستەی دەکردین، هەرچەندە دەمزانی کە پێویستە زۆر شوکری خودا بکەین و، بەندەیەکی باش بین بۆی، بەڵام داوەکانی ژیان و، ئەو هەموو ناپاکی و خراپەکارییەی دووچاریان دەهاتین بەرەو ڕێگە خراپەکە ئاڕاستەیان دەکردین.

دایکی ڕەحمەتیم هەمیشە ئەم ئامۆژگارییەی دەکردین:"ئامان، هەڵەو تاوان مەکەن، چونکە وا نەبێت ئەو پیاوە نوورانییە جارێکی تر نایەتەوە بەهانامانەوە. ئەو لوتفێکی پەروەردگارەو، خوای گەورەش هەمیشە بەهانای کەسانی چاکەکارەوە دەچێت، بۆیە ئێوەش لە هەر

بەلاو شکستهێنانێکتاندا چاکەخوازبن و، تا بەهاناوە هاتن و کۆمەکی پەروەردگارتان ببینن".

## بە ناچاریی پەلکێشی خراپەکاریی کراین:

کارە خراپەکانی دنیا و، ناپاکیی خەڵکی لە دەورمان و، دوژمنە ستەمکارەکان یەخەیان بەرنەدەداین، هەرکاتێ ڕووداوەکان هێواش ڕێچکەی خۆیان بگرتایە، دەردیی سەری نوێ چاوەڕێی دەکردین، هەرکاتێکیش خۆمان گورج دەکردەوەو، دەمانوت ئیتر لە خراپەو بەدکارییەوە خۆمان تێوە ناگلێنین، پێشهاتێکی تر دەبووە کۆسپی ڕێگەمان و، ئێمەی بەرەو هەڵە پەلکێش دەکرد.

چەند جار لە مەی خواردنەوەو جگەرە کێشان تۆبەمان کرد، بەلام داوەکانی دوژمنان و ناحەزانمان گرفتاری کینەو تووڕەییان دەکردین و، ئێمەش ناچار بۆ ساتێك ئارامیی پەنامان بۆ مەی و جگەرە دەبردەوە. هەر کە بڕیاری دامەزراویی و خۆچاککردنمان دەدا، جارێکی دی کێشەیەك یەخەی پێ دەگرتین و، لەکۆتاییدا خۆمان لە بەندینخانەدا دەبینییەوە.

کەسانی ناپاکی دەورمان هەوڵیان دەدا هەر کێشەو دزی و پێشهاتێکی خراپی گەڕەکەکەمان بخەنە ئەستۆی ئێمە. بەهۆی ئەو بوختانانەی کە بۆمان دەکران، هەموو ڕۆژێك ڕووبەڕووی لێپێچینەوەی بەندینخانەکان دەبووینەوە، کە زۆرجار لەسەر تاوانێك بوو، کە ئێمە

نەمانكردبوو، ئەمەش بە چەند هێندەی تر ئێمەی بەرەو گرتنەبەری ڕێی خراپەو بەدكاری ئاڕاستە دەكرد. وادیاربوو هەر بەڵایەك لە گەڕەكەی خۆماندا بەدی بكرایە، لە ئەستۆی ئێمەدا تۆمار دەكرا.

ئایا ئێمە زۆر بێتاوان و بێ گوناه بووین؟ بێگومان نەخێر، هەندێك هەڵەمان دەكرد، بەڵام بە ئەندازەی ئەو هەموو بوختانانەش نەبوون كە بەناومانەوە هەڵدەبەستران. ئەگەر خەڵكی دەستبەردارمان بووبوونایەو، دەستیان لە یەخەمان هەڵبگرتایە، ئێمە هەر بەڕاستی دەمانویست ڕێی ڕاست بگرینەوە، بەڵام بەداخەوە ئەمە ڕووی نەدا، واتە لە هەموو لایەكەوە پەلكێشی گرتنەبەری ڕێی هەڵە دەكراین، ئەمە زۆر كاری دەكردە سەر ڕەفتارو هەڵسوكەوتەكانمان.

ئاخ، چ ڕۆژگارێك بوون! چیمان نەچەشت؟! ئەو شەق و زللەو لێدانانەی لە بەندینخانە بەبێ تاوان دەمانچەشتن. ناودەركردن بە (سەرسەری گەڕەك)یش لەولاوە بووەستێت..

بەجێی ئەوەی مرۆڤەكان بەزەییان پێماندا بهاتایەوە، دانیان لێ تیژ دەكردین و، بەكینەوە لێیان دەڕوانین. هەموو ئەمانە چەند هێندە ئێمەیان یاخی كردبوو، هەزاران جار بووینە قوربانی بوختانیان. ماڵێك دز چوو بووە سەریان، ئاڵتونەكانی ماڵەكەیان دزیبوو، ئەوەشیان كردە ئەستۆی ئێمە و، ئەو شەوە تا دەمی بەیان لە بەندینخانە لێیانداین. هەستم دەكرد لەهاواری من و براكەم تەنانەت دیوارەكانی

بەندینخانەکەش هەستی بەزەییان تێدا بزوابوو. دواتر کە دزە ڕاستەقینەکان قۆڵبەست کران، ئێمەیان ئازادکرد، یەکێك لە پۆلیسەکانی بەندینخانەش زۆر بە توندی لە بەرامبەری ئەفسەری لێپرسراویدا وەستابوویەوە.

وتبووی:"ئایا ئێوە هیچ ویژدانتان نییە؟ وا هەموو تاوانێك دەخەنە ئەستۆی ئەم منالانە؟".

بەسە ئیتر بەرگەی ئەم ستەمە ناگرم، بەلێدانی ئەم منداڵانە قێز لەخۆم دەکەمەوە، تەنانەت شەرم دەکەم، لەم بەرپرسیاریەتییە بمبەخشن، ئەگەرنا خۆم دەست لەکار دەکێشمەوە.

بێگومان پۆلیسیش ئەرکی خۆیان بەجێ دەهێنا، چونکە هەر تاوانێك بکرایە، دەستبەجێ خەڵکی گەڕەك شکایەتیان لە ئێمە دەکرد، ناچار ئەوانیش بەرۆکیان دەگرتین.

## بوختانێکی تر

هەر لەو ڕۆژانەدا ڕووداوێکی تری دزی کردن ڕووی دابوو، کە هەرگیز لە یادم ناچێتەوە، جارێکی تر دز پەلاماری ماڵێکیان دابوو و، ویستبوویان بازنی ژنی ماڵەکە ببەن، دیاربوو نەیانتوانیوە، بۆیە قۆڵیان بڕیبوو. بێگومان ئەمەشیان کردە گەردنی ئێمە.

پۆلیسەکان شەو هاتن و، ئێمەیان لەخەو هەستان و، من و براکەمیان بەهات و هاوار پەلکێشی بەندینخانە کرد. دایکی ڕەحمەتیم چەند تکای تیاکردبوون، چەند لەخۆی دابوو، بەلام هیچ سوودێکی نەبووبوو؟

ڕووداوەکە زۆر مەترسیدار بوو. ماڵەکەمان بە پۆلیس دەورە درا، دواتر دایکم و خوشکەکەمیان هێنایە بەندینخانە. خەڵکی بێ ویژدانیش بۆ تالانی و دزی هەڵیان کوتابوویە سەر ماڵەکەمان و، کەلوپەلەکانیان پەرش و بلاوکردبووینەوەو، هەموو شتێکیان دابوو بەسەریەکدا.

پۆلیسەکان تەنانەت لە بەندینخانەش ئێمەیان خستە ژێر چاودێرییەوە و، لێپرسینەوەیەکی زۆر چڕپشیان لەگەڵ کردین، تەنانەت ئازاری دایکم و خوشکە داماوەکەشمیان دابوو، بەلام سوپاس بۆ خوا کاتێک دزی سەرەکی چووەتە ماڵێکی ترەوە قۆڵبەست کراوە، پاش ئەمەش ئێمەیان ئازاد کرد، بەلام ئەو ڕووداوە کاریگەری سەلبی لەسەر من جێهێشت و، بەرامبەر هەموو خەڵك، دەوڵەت، دەوڵەمەندەکان، کەسە هەبووەکان و، ئەوانەی بوختانیان بۆ ئێمە هەڵدەبەست کینە لەدڵ بووم و، هەستی دوژمنایەتییەکی وەهام لەناخمدا پەروەردە کرد بوو، کە هیچ کەس نەیدەتوانی پێشم لێ بگرێت، وەك دەڵێن:"خوێن بەری چاوی گرتبووم" لە ژیانمدا تەنها

ئامانجێکم مابوو، ئەویش لەناوبردنی تەواوی دوژمنان و ئەوانە بوو کە بوختانیان بۆ هەڵدەبەستین.

## خاوەن ماڵەکەمان کۆچی دوایی کرد:

مامە پیرەی خاوەن ماڵمان کۆچی دوایی کرد، -خوا لێی خۆش بێت-، کە باوکایەتیەکی میهرەبانانەی بۆ ئێمە پیشاندا و، لە سەختترین ڕۆژەکانماندا پشتگیریی لێ کردین، هەرگیز کرێی خانووەکەی لێ وەرنەگرتین، لەسەروو ئەوەشەوە هەندێك لە پێویستیەکانیشی بۆ دابین دەکردین.

مرۆڤێکی زۆر بەڕێزو بەڕەوشت و، زۆر دیندار بوو، تەنها ئەگەر من و براکەم لەماڵ بووینایە دەهاتە ماڵمان، بەڵام کاتێك کە دایکم بە تەنها لەماڵ بووایە نەدەهات.

کە مامە پیرە وەفاتی کرد، ئێمەش لەلای سەرییەوە ئامادەبووین، خۆی دوو کوڕی هەبوو، بەڵام بە تەنیا دەژیا. بەڕاستی من هەرگیز گیان سپاردنێکی وەهام نەدیوەو، نەبیستووە. هەروەك مامەپیرەیەکی هاوڕێی گیانی بە گیانی بۆی باسکردم: وەك بڵێی ئەو پیاوە بۆ مردن نا، بەڵکو بۆ پشویەك، ئاهەنگێك، جەژنێك دەچوو، چونکە چەند ڕۆژ لەوەوپێش خۆی بۆ ئامادەکردبوو و، هەموو کەلوپەلەکانی ماڵەکەی پاککردۆتەوەو، ئەو ڕۆژە هەینی بوو.

دەستنوێژێکی پاك و پوختی گرتبوو و، پێش نوێژ خوێندن قورئان و پاشان ویردەکانی جەوشەنی خوێندبووەوە.

نوێژی کردبوو و، ویردەکانی تەوبەو ئیستیغفاری خوێندبوو و، بەرگی پاك و نوێی پۆشیبوو، پاشان چووبووە سەر جێگەکەی و، ڕووەو قیبلەو لەسەر ئەژنۆ بەچۆکدا هاتبوو. باسی سات بە ساتی پێش گیان سپاردنی بۆ هاوڕێکەی کردبوو. ساتی گیان سپاردنیشی وتبووی:"پەروەردگارا، وا دێمە بارەگای زاتی موبارەکت، لە حضورتدا بە ڕیزکردنی تاوانەکانم و دەستی خاڵیم ڕووم ڕەش مەکە".

پاشان بەهاوڕێکەی تەنیشتی وتبوو:"وا هاتن، ئیتر من ڕێبوارم. گەردنم ئازاد کە"و، بەیەکجاری گیانی سپاردبوو. چەند کۆتاییەکی بێوێنە، جوان و پڕ پەندە، وانیە؟ بەڕاستی مرۆڤ ئەگەر خاوەنی هەموو سامانی دونیایش بێت، بۆچی باشە کە بەبێ ئیمانی بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری.

من ئێستا دڵنیام کە دەوڵەمەندترین مرۆڤ، ئەو مرۆڤەیە کە بەئیمانەوە دەگەڕێتەوە بارەگای پەروەردگاری، چونکە ئەو بە بەهەشتێکی هەتاهەتایی و ئاسوودەیی نەبڕاوە شاد دەبێت. هەژارترین مرۆڤیش ئەو مرۆڤەیە کە بەبێ ئیمان و بێ تێشووی چاکە ژیانی هەتاهەتایی لە بەختەوەریدا لەدەست دەدات. ئەگەر مرۆڤەکان

تەنها جارێك بەباشی لەمە تێبگەیشتنایە، نە خراپەکاری و نە شەڕ و نە ناپاکیی ڕوویندەدا.

ئامادەکارییەکانی بە خاکسپاردنی مامە پیرەی خاوەن ماڵمان تەواوبوون و، ویستیان بە خاکی بسپێرن کۆتری سپی و چۆلەکە لە گۆڕستانەکە لە شەقەی باڵیان دا، ئەم فڕین و خوێندنەی باڵندەکان تا نزیکەی دە خولەك بەردەوام بوو و، سڵیان لە مرۆڤەکان نەدەکردەوە. ئیمامەکە وتی:

"لەجێی خۆتان دانیشن، کارتان بەو باڵندانەوە نەبێت". ئەم زاتە مرۆڤێکی زۆر موبارەك بووە. وادیارە ئەم هەموو مەخلوقە بۆ خواحافیزی و دوعاکردن هاتوون، یاخود بۆ پێشوازی لێکردنی ئامادەن".

ئەوانەی لە ژیانیاندا چاکەخوازن و، خوا ناسن و، بە هانای ستەمدیدەو بێتاوانان و، بێکەسانەوە دەچن، بەم جۆرە دەبێت وەك ئەوەی هەر لە یەکەم ساتی مەرگییەوە بە دوا مەنزڵگەی ئارامیی شاد ببێت، ئەو جۆرە کەسانە فریادڕەسی میهرەبانیی کۆمەڵگەن، گەر ئەوان نەمێنن، پەروەردگار چیتر ڕێگە بە کەسی خراپ نادات و، قیامەت بەرپا دەکات، دڵنیام ئەگەر ئەم مرۆڤە بەڕەوشت و پایەبەرزانە نەبن بێتاوان و، دەردەداران هێندەی تر بێچارە دەبن، خوایە گیان نموونەی کەسی باش هەر زۆر بێت.

## له خانووەکە دەرکراین:

گەورەترین دەستگیرۆییکارمان لە ژیاندا مامە پیرە بوو، ئەویش کە تەنها ئومێدمان بوو ماڵئاوایی لێ کردین و، بەرەو جیهانی هەتاهەتایی و بەهەشت و ئارامیی بەڕێ کەوت. ژیانی پڕ مەینەتی بەردەوام بوو و تەنانەت سەختییەکانمان چەند هێندە بوونەوە.

خزمە چاوچنۆکەکانی مامەپیرە کە پێشتر هەرگیز سەردانیان نەدەکرد، ئەوانەی تەنانەت ئامادەی مەراسیمی بەخاك سپاردنیشی نەبوون، هەر کە هەواڵی مەرگیان بیستبوو، بێ سێ و دوو خۆیان گەیاندە ماڵەکەی و، ماڵەکەیان سەرووژێر کرد و، بەهیوای دۆزینەوەی گەنجینەی مامەپیرەی ڕەحمەتی بوون، کەلوپەلی ماڵەکەیان لەنێو خۆیاندا بەشکرد.

دەگونجێت ماڵ و منداڵ و خزمان هێندە بێ ویژدان بن! منداڵ پەروەردە بکەو، لەپێناو ئاسودەییدا تاڵیی و سوێرییان بچێژە، بەڵام ئەوان لە دژوارترین ڕۆژدا بە تەنها بەجێتبهێڵن، تەنانەت ئامادەی بەخاك سپاردنیشت نەبێت، دواتریش تەنها هەوڵی مسۆگەرکردنی میرات بدات، دەبێت ئەمە چۆن وەسف بکرێت؟ نازانم بەڵام دڵنیام لە ڕاستی ئەو پەندەی پێشینان وتویانە: (چی بچێنیت، هەر ئەوە دەدوریتەوە)، هەم لەم دونیایەو، هەم لە ئاخیرەتیشدا.

بۆ ئەوان تەنها پارەو سامانی خوالێخیشبوو گرنگ بوو، نەك خودی خۆی، خوالێخۆشبووش ئەمەی باش زانیبوو، بۆیە هیچ شتێکی بە میرات بۆ خزم و دۆستان بەجێنەهێشتبوو و، هەموو شتێکی لەڕێی خوادا بەخشیبوو.

خانووەکەشی بەخشیبوو بە ڕێکخراوێکی خێرخوازیی، ئەو ڕێکخراوەش بۆ چۆڵکردنی خانووەکە ئاگادارییان بۆ ناردین. یا ئەوەتا کرێی نیشتەجێبوونمان بۆ دابین دەکات، یاخود ماڵێکی دیکەمان بۆ دەدۆزێتەوە.

خوا بیانپارێزێت کە لە بێلانەیی ئێمە تێگەیشتن، بۆ نیشتەجێبوونمان کۆمەکییان کردین.

## گەنجە فریشتەئاساکان:

کاتێك خێرخواز و کەسانی چاکەخواز لێپرسراوێتی خانووەکەیان گرتە دەست، لەماڵەکەی خوالێخۆشبوودا چوار پێنج خوێندکاری زانکۆی زۆرباشیان نیشتەجێ کرد، کە هەموویان گەنجانی ئیماندار بوون و، هێندە بە ئابڕو و ڕەوشت بەرز بوون، کە سەریان زۆر کەم هەڵدەبڕی، بۆ ئەوەی تووشی گوناه و تاوان نەبن. لەلایەك شەقامەکان جمەیان دەهات لە گەنجانێکی بکوژو کینە لە دڵ و لەڕێ لاداو، لەلایەکی تریشەوە گەنجانێکی نوورانی هەبوون، کە لە دانیشتوانی بەهەشت دەچوون، هەندێك جار ئێمەشیان بۆ لای خۆیان

بانگهێشت دەکرد... کەسانێکی تا بڵێی سینە فراوان و، ڕۆح شیرین بوون، ئێمە بە بێگەردییان زۆر سەرسام بووین. ئەوان بە تەمەن لە ئێمە گەورەترو بە ئەزموونتر بوون و، بۆ چا خواردنەوە بانگهێشتیان دەکردین و، کتێبیان بۆ دەخوێندینەوەو، باسی ئایینیان بۆ دەکردین، ئێمەش کە دەچووینە لایان ناخمان ئاسوودە دەبوو و، لە کەش و هەوای خنکێنەری ژیان دووردەکەوتینەوەو، لەسایەی ئەو کەش و هەوا ئارامەدا وچانێکمان دەدا.

ئەوان کەسانێك نەبوون کە لە زەلکاوی ناپاکییەکانی ژیاندا بژین، بەڵکو گەنجانێکی فریشتەئاسا بوون، کە لە جیهانێکی زۆر پاك و بێگەرددا دەژیان.

نوێژەکانمان بە جەماعەت ئەنجام دەدا، لەکۆتایی نوێژەکەشدا بە کۆمەڵ و بە سەدایەکی زۆر شیرین ویردەکانمان دەخوێند، کە هێندە کاریگەر بوو، من لەپاش تەواوبوونماندا، هەستم دەکرد ڕۆحمان خاوێن دەبێتەوە.

پاشان باسی هەندێ بابەتی ئایینی نێو پەیامەکانی نووریان بۆ دەکردین، ناوەڕۆکی بابەت و باسەکانیش بۆ دەردی ئێمە دەرمان بوون، هەروەها زۆر لام سەیربوو، کە ئەو (جەوشەن)ەی پیاوە نوورانییەکە لەبارەیەوە بەدایکمی دەوت:"بیخوێنە، ئەمە دوعایەکی زۆر کاریگەرە ! ئینشاڵا شیفات بۆیەت، لای ئەو گەنجانەش هەبوو".

بێگومان ئەگەر ماوەیەکی زیاتر لەگەڵ ئەو گەنجانەدا بووینایە، لە زەلکاوی تاوان و خراپە ڕزگارمان دەبوو و، ڕێی ڕاستمان دەگرت، بەڵام ئەو هەلەشمان لەدەست چوو، بەڵام بە تەواوی بەهۆی کەمتەرخەمی خۆمانەوە نەبوو، بەڵکو دەردیسەری و گێژاوی ژیان بەجۆرێك ئێمەی گرفتار کردبوو، کە بەردەمی خۆمان بە ڕوونی نەدەبینی، سەرەڕای ئاگری تۆڵەسەندنەوە کە لە ناخماندا کڵپەی سەندبوو، گەمەی ڕۆژگارو مرۆڤە خراپەکان هیچ سوچێکی خاوێنی لە ڕۆحماندا نەهێشتبووەوە، خراپتر لەوەش ڕووداو و پێشهاتە سەخت و ئازاراوییەکان بوون کە دووچاریان دەهاتین.. بەجۆرێك لەم گێژاوەدا گرفتاربووبووین، کە بۆ بەردەوامی دان بە ژیانمان لەگەڵ ئەواندا، ناچار دەبووین وەك خەڵکی دەوروبەرمان بژین.

لەو ڕۆژگارەدا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی دیکە بووینەوە، کە چرۆی باوەڕو خواناسی پێش پشکووتن هەڵوەراند.

لە گەڕەکەکەماندا جارێکی دیکە دز هەڵیکوتیە سەر ماڵێك و، دەستدرێژییان کردبووە سەر خانمی ماڵەکەو، ئاڵتونەکانیشیان دزیبوو هەڵهاتبوون. ئەمجارەش بێگومان هەر ئێمە بووینە قۆچی قوربانی و، ڕاپێچی بەندینخانەیان کردین. گەنجێك کە بە هیچ شێوەیەك نەماندەناسی، دەیوت:"ئەمە کاری ئەمانە، خۆم ئەوانم دی لەماڵەکە هاتنە دەرەوە". ئەشکەنجەو ئازارو لێدانێکی زۆرمان

چەشت، تەنانەت ئەندامە ناوەکییەکانی جەستەم هێندە زەبری پێگەیشتبوو، کە پاشەڕۆکەم خوێنی تێدابوو. ددانەکانم و، لێوەکانم زاماربووبوون، جێی شینبونەوەی لێدانەکان بۆ چەندین مانگ سارێژ نەبوون. بێگومان براکەشم هەمان ئەشکەنجە درابوو، بەڵام خوای گەورەم هات بە هانامانەوەو، لەکۆتاییدا ڕزگارمان بوو.

ئەمە چۆن دادگەرییەکە! سەرەڕای ئەوەی بێتاوان بووین ئەو هەموو ئەشکەنجەیەمان چەشت، ئیتر چۆن کینە لەدڵ نەبین، ئەستەم بوو بەرامبەر ئەو کەسانەی ئازاری بێکەسان دەدەن هیچ هەستێکی باش دەربڕین. لە ڕۆح و دڵمدا هەرچی جوانی و باشی هەبوون، هەمووی سڕابونەوە، ئەو گەنجەش هاتە ڕیزی دوژمنانمەوە، ئیتر دوژمنەکانمان سێ لایەن بوون، تەنانەت ئەو گەنجە باشانەی دراوسێشمان بەچاوی ڕق و کینەو نەفرینەوە تەماشایان دەکردین، واتە لەگەڵ هەموو جوانیەکاندا پەیوەندیمان پچڕاندبوو.

# بەشی چوارەم

## سەختترین ئازاری ژیانم



ئەو کێشانەی دووچاریان دەهاتین، کۆتاییان پێ نەدەهات و، لەبەردەم دەستپێکی بەڵاو مەینەتی و ڕووداوی سەختتردا بووین، زریانێکی خۆمەڵاسداو چاوەڕێی دەکردین، کە تەواوی ژیانمانی شێواند، کە ئێش و ئازار و لێدانەکانی پێشووی لەیادبردینەوە.

ئێوارە لەگەڵ براکەم پێکەوە لە ئیش گەڕاینەوە بەرەوماڵەوە. بەڵام دایکم کە نەیدەتوانی لە جێگاکەی خۆی بەرزبێتەوە، بە خۆخشاندن هاتبووە بەردەمی دەرگای دەرەوەو، لە چاوەکانیدا ترس و دڵەڕاوکێیەکی قوڵ دەخوێندرایەوەو، ڕووخساری تاسابوو. پرسیارم لێکرد: "دایکە چی بووە؟ بۆچی لێرەدایت؟"، سەرەتا وا گومانم برد دوژمنەکانمان پەلاماری ماڵەکەیان داوین، بەڵام دایکم هەواڵێکی پێدام کە هیچ بە خەیاڵمدا نەهاتبوو.

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە هاواری کردو وتی:

– کوڕم دادەتانی لێ نیە.

ئەم قسەیەی وەك بۆمبێك زەبری لە مێشکمدا.

بەبێ وتنی یەك وشەش لە جێگەی خۆم دانیشتم، ئەو قسەیە وەك پشکۆیەك ناخمی دەسووتاند.

چەندین جار تەزوو بە لەشمدا هات و، عارەقێکی سارد سەراپای بوونمی سڕکرد.

بەخۆمم دەوت: "ئەی هاوار، ئەو دوژمنە چەپەڵانە دادەشم لەناو دەبەن، خوانەخواستە ئەگەر شتێکی وەها ڕووبدات، ژیان بۆ من دەبێتە ژەهرێکی سامناك و، لە بەرامبەر دوڕیانێکدا دەبم: یان مردن یاخود کوشتن. لەم خەیاڵانەدا بە قوڵی نقوم بووبووم.

–تەنانەت گوێم لێ بوو کە دایکم دەیوت: "کوڕم سەیری من بکەو، شانمی ڕادەوەشاند لە کۆتاییدا خۆم کۆکردەوەو پرسیارم کرد:

– دایکە، کەی ڕۆیشتە دەرەوە؟

– کوڕم نیوەڕۆ. بۆ نان کڕین چوو بووە دەرەوە.

براکەم لەماڵەوە جێهێشت و، بەپەلە خۆم گەیاندە نانەواخانەکە، بەڵێ، نیوەڕۆ نانی کڕیبوو و، بەبێ وەستان گەڕابویەوە، بەڵام خۆ ماوەی نێوانی ماڵەوە و نانەواخانەکە (١٠٠–١٥٠) مەتر بوو.

**خۆم گەیاندە بنکەی پۆلیس:**

من بەشپرزەییەوە چووم بۆ بنکەی پۆلیس. لەوێ لەبەرئەوەی هەموویان منیان دەناسی، کە لەناکاو بینیانم سەریان سوڕما، ئەفسەرێك وتی:

– خێرە؟ تۆ بەپێی خۆت نەدەهاتی بۆ ئێرەو، ئێمە بۆت دەگەڕاین پاشان دەماندۆزیتەوە. کەواتە هۆکاری ئەم هاتنە لەناکاوەتان چییە؟

پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە، کە ئەفسەرەکە ترس و شپرزەیی لە ڕووخسارمدا بەدی کرد وتی: چی بووە، وا ڕەنگت پەڕیوە؟ ئیتر کەوتم بەسەر قاچیدا.

بەڕاستی سەیر بوو وا چاوەڕێی یارمەتی بووم لەو ئەفسەرەی کە لێی دام، زیندانی کردم، هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی پێچەشتمو، وتم:

– دادەمیان فڕاندووە، تخوا بۆمان بدۆزنەوە، شتێکی لێ بێت، من دەمرم، ناتوانم بژیم، یارمەتیمان بدەن، ئەو ئەفسەرەی دەیان شەو تا بەیانی لێیداوم، گۆڕابوو و، یارمەتی منی دەدا، ئەویش لەبەرامبەر هاوارو شڵەژانی مندا، دەستەوەستان بوو بوو، بەڵام شانی گرتم و دایینیشاندم و، ئاوی بۆ هێنام و، هەوڵی دەدا هێورم بکاتەوەو، دڵنەوایم بکات، وتی:

– مەترسە، ئێمە ژیانمان بۆ ئاسایش و ئاسوودەیی هاوولاتیان تەرخان کردووە. خوشکەکەی تۆ بە خوشکی منیش هەژمار دەکرێت و، بۆ دۆزینەوەی ئەو چیمان لەدەستدابێت درێغی ناکەین. لەپێناوی پاراستنی ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵگادا ئەو لێدانەی دوێنێ لە تۆم دەدا، دڵنیابە دەبێتە بەشی ئەوانەی کە خوشکەکەتیان فڕاندووە.

بەڕاستیش ئەم وتەیەی جێبەجێ کرد، من و ماڵەکەمیان خستە سایەی پارێزگاریی پۆلیسەوە. پاسەوانییان دەکردین. ئەوانەی تریش بەردەوام بوون لە گەڕان.

## چاوەڕوانییەك لەبێ ئۆقرەییدا:

تارمایی خەم و پەژارە کەشوهەوای ماڵەکەمانی داگیرکردبوو و، هیچ شتێك ڕەنگ و چێژی نەمابوو لەبەر چاوماندا، دایکم لەپێش چاوەکانماندا، لە هەراسانییدا دەتوایەوە. ئەو، کە "(ئاخ و داخ)ی دەکرد. ئەو ئاهەی کە لەزاری دەردەچوو، وەك کڵپەی ئاگر بڵاودەبوویەوە. ئایا دڵی دایك توانای بەرگەگرتنی ئەم ئازارەی هەیە؟ شیوەن و ناڵەی دڵی ئەو لە باسکردن نایەت. نەخۆشییە کوشندەکەی خۆی پەراوێزخستبوو و، بە ئازاری دووری خوشکەکەمەوە دەتلایەوە.

منیش ئەوەندە لە حەسرەتدا سەرم بە دیوارەکەدا کێشابوو، کە لە چەند لاوە سەرم شکابوو، ئەفسەرەکەش لەلایەك براکەم و، لەلایەکیش دڵنەوایی منیان دەکرد.

ئەو شەوە بەو شێوەیە تێپەڕی: بە گریان و، ناڵەو، شیوەن.

ڕۆژی دواتر نزیکی نیوەڕۆ هەواڵ هاتبوو. ئاخ، بۆ نەبیستنی ئەو هەواڵە، بۆ نەبینینی خوشکەکەم لەو حاڵەدا، ئامادەبووم چیم هەیە بیبەخشم، بەڵام بەداخەوە ئەم دیمەنە نامرۆڤانەیشم بینی.

خوشکەکەمیان لەسەر باڵەخانەیەکەوە کە هێشتا تەواو نەبووبوو فڕێدابوویە خوارەوە بۆ چاڵێك و، دەستیان لەدواوە بەستبۆیەوە و، دەمیان بەستبوو... لەکاتێکدا ئێمە هەرگیز چاومان نەبڕیبووە ئابڕوو و ناموسی هیچ کەسێك، کەچی دەستدرێژییان کردبووەسەر خوشکەکەم. ئەو جانەوەرە دڕندانە حاڵێکیان بەسەر خوشکەکەم هێنابوو، کە هیچ مرۆڤێك بە خەیاڵیدا نایەت، بە تەواوی لە خوێنی خۆیدا تلابوویەوە. ئەمە تەنها لە جانەوەرێکی دڕندەو بێ ویژدان دەوەشایەوە، مەحاڵە مرۆڤێکی ئاسایی کاری وای لێ بوەشێتەوە.

دوژمنایەتیش یاساو ڕێسای خۆی هەیە. تەنانەت مرۆڤ بێ لەکەدارکردنی هەست و ئابڕووی مرۆڤایەتی دەکوژرێت! بێگومان مەرگ لای کەس خۆشەویست نیە، بەڵام کە ڕووداوەکان بەم جۆرە ئاڕاستە دەگرن، چی لە مردنێکی سەلامەت و بەئابڕوو خۆشترە!

له هەموو بارودۆخێکدا مافی ئەوەی هەیە کە بە پاراستنی هەستی مرۆڤبوونیەوە بمرێت، نەك بەم شێوە دڕندانەیە. تەنانەت ئەگەر بەرامبەرەکەت گەنجێکی بێتاوانی بێ دەسەڵات بێت... ئەمە کام ویژدانێك، کام عەقڵێك، قبوڵی دەکات؟

کەواتە چۆن تۆڵەمان نەدەسەندەوە لەوانەی ئەم ئەشکەنجەیان بە مرۆڤێکی بێ تاوان چەشت، کەسێك هەیە لە بەرامبەر ئەم ستەمەی بەرامبەر خوشك و براو باوکی بکرێت و بێ هەڵوێست بێت؟! ئایا دەتوانێت بڵێت: "ئیتر قەدەر بوو و، هەرچۆنێك بێت با من دەستم خوێناوی نەکەم!".

ڕەنگە بڕواکردن بە دادپەروەری دادگاو یاسا چارەیەکی گونجاوبووبێت.. بەڵام بۆ کەسانێك کە تەواوی ژیانیان بە ئازار بەسەربردووەو، بێ خاوەن و سەرپەرشتیار پێگەیشتوون، مەحاڵە بە هۆشێکی سەلامەت و دروستەوە هەنگاو بنێن. لەسەرو هەموو ئەمەشەوە، هەرزەکارین، ئەوا هیچ هیوایەك لە ئاسۆدا نییەو، تازە کار لەکار ترازابوو. لەو ساتەدا مردن بۆ ئێمە جەژن و ئاهەنگ بوو. بکەری تاوانەکە لە بنەڕەتدا ئاشکرا نەبوو، بەڵام ئێمە خۆمان دەمانزانی.

کوشتنی دڕندانەی خوشکەکەم لە دڵی دایکمدا چەندین زامی سارێژنەبووی هەڵکەندو، تاکە تروسکەیەکی ئومێد لە ژیانیدا نەمابوو، بەجۆرێك هەموو ساتێکی ئەشکەنجەو چەوسانەوە بوو.

کاتێك خوشکەکەمیان خستە گۆڕەکەوە، منیش خۆم هەڵدایە گۆڕەکەوەو هاوارم کرد:"منیشی تیا بنێژن، سەری منیش داپۆشن. با منیش بمرم، تخوا لەو جیام مەکەنەوە"، ئیتر بەرگەگرتن یاخود سەبرو ئارامیی دادی نەدەداین.

هێندە دڕندانە کوشتبوویان، خوێنەکەی هەر نەدەگیرسایەوە، تەنانەت کفنەکەشی خوێناوی بوو بوو.

ئاخ، خوشکە بێ نازەکەم... بێ ئەوەی ساتێك خۆشی بچێژێت، بێ ئەوەی وەك کچانی هاوتەمەنی خۆی بژی، بێ ئەوەی چێژ ببینێت لە تەمەنی لاویی، پێش چرۆکردنی گوڵی تەمەن و، هەر لەسەرەتای بەهاری تەمەنیدا کۆچی کرد.... لەوانەشە بەبێ تێوەگلان لە گێژاوی خراپەو تاوانەوە ڕزگاری بووبێت، بەڵام ماڵئاوایی لێکردنی بەو شێوەیە بەرگە نەدەگیرا. کە باسی ئەو ساتانە دەکەم، هێشتا دەلەرزم، وەك ئەوەی ئێستەش زامەکانی خوێنیان لێ بچۆڕێت. ئەو ئاگرە هێشتا لەناخمدا کڵپە دەدات.

پێویستە لەیادم نەچێت، تەنها کەسێك کە ئاگاداری خەم و پەژارەی ئێمە بوو و، هاوبەشی خەممان بوو، ئەفەسەرەکە بوو. من ئەوم هەمیشە وەك دوژمن ناسیبوو، بەڵام هەڵوێستێکی ڕاستەقینەی نواند.

## ئاخ، دایکە گیان:

دایکم تەمەنێکی پڕ چەرمەسەری ژیابوو و، بەجۆرێك کە مانەوەی ئەو لەو ژیانەدا خۆی بۆ خۆی موعجیزەیەکی تر بوو.

دایکم لە ژیانیدا هەزارەها جۆری کێشەو دەردی سەری و بێکەسی و بەدبەختی بیّ لانەییەکی چەشتبوو، بەڵام هەرگیز ناشکوریشی نەدەکرد، بەڵکو بەپێی توانا هەوڵی دەدا بە بەندایەتیەکی باشی پەروەردگاری بکات. بەڕاستی سەرەڕای ئەم هەموو بەڵاو ناڕەحەتییە نەشێوانیی باوەڕی خۆی لە خۆیدا وزەو پێگەیشتوویەکی زۆر مەزنی پێویست بوو.

پێنج شەش مانگ بەسەر مەرگی خوشکەکەمدا تێپەڕیبوو و، کۆتایی مانگی ڕەمەزان بوو، کە دایکم لە دواڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنی دەژیا. ئێمەش شەو و ڕۆژ وەکو لێکۆڵەرەوە بەدوای بکوژەکانی خوشکەکەمدا دەگەڕاین. لەکۆتاییدا سەرەداوێکی گرنگمان دۆزییەوە و، وادیاربوو بکوژانی خوشکەکەم جەلادە بکوژەکانی باوکم بوون. باوکم لەسەر مەسەلەیەکی ئابڕوو ناموس کوژرابوو و، ئەوانیش تۆڵەی ئەمەیان سەندبوویەوە. لەسەروو هەموشیانەوە (حەمدیە شەل) بوو، کەواتە ئامانجەکە ئاشکرابوو. پێویست بوو بەخێرایی خۆمان گورج بکەینەوەو، پێش ئەوەی ئەوان گورزێکی دیکەمان لیّ بوەشێنن، ئێمە هەنگاوی خۆمان بنێین.

لەگەڵ براکەمدا پێکهاتین لەسەر داڕشتنی پلانی ژیرانەو گونجاو و، بۆ ئەمەش پێویستمان بە چەکێکی باش و سەیارەیەك بوو. هەروەها پێویست بوو چەند کەسێکی تر بۆ ئەم کارە بدۆزینەوە. هەموو ئەمەش پێویستی بە بڕێك پارەی زۆ بوو.

بۆ پەیداکردنی ئەم پارەیەش پلانی دزیەکمان داڕشت، بەڵام بەهۆی خراپی باری تەندروستی دایکمەوە جێبەجێ کردنی پلانەکەمان بۆ ماوەیەکی کورت دواخست.

دایکم دەیزانی ئێمە نیازی چیمان هەیەو، بەهەموو توانای هەوڵی دەدا ڕێگریمان لێ بکات. ئێمەش بۆ ئەوەی دایکم خەم نەخوات، لەبەرچاوی ئەودا وا خۆمان نیشان دەدا کە سەرقاڵی هیچ پلانێك نین.

ئای دایکە گیان، لەگەڵ هەموو خەم و دەردی سەری و ئازارەکانی خۆیشیدا خەمخۆری ئێمە بوو و، دەترسا لەوەی بەڵایەکمان بەسەردا بێت.

## شەوێکی پیرۆز:

دیاربوو دایکم هەستی کردبوو دوا ساتەکانی تەمەنی نزیك بوونەتەوە، بۆیە ئێمەی نارد بەشوێن ژنێکی دراوسێماندا، ئەویش دایکمی بۆ ئەم گەشتە بێ کۆتاییە ئامادەکرد و، ماڵەکەی ڕێکخست و، پاکوخاوێنی کردەوە.

بە ئێمەی وت کە بە هیچ جۆرێ دەوری چۆڵ نەکەین. ئەو شەوە یەکێك بوو لە دوا شەوەکانی قەدر لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، کە تێیدا خوای گەورە لە گوناهکاران خۆش دەبێت.

ئێمە لێی دوورنەدەکەوتینەوە، بەڵام خۆ چاوەکانی ئەو زۆر دوور دەیانڕوانی و، ئێمەی نەدەبینی، وادیاربوو چاوی لە دوا مەنزڵگەی خۆی بوو. کە قسەی دەکرد خەندەیەکی شیرین بە ڕووخسارییەوە دەبینراو، سیمای پرشنگدارو نوورانی دەهاتە پێش چاو، ئێمەش بە سەرسامی و تێڕامانەوە لە ڕووخساری دایکمان دەڕووانی. ئەو شەوە شەوێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو و، وێستگەیەکی گرنگی دیکەی ژیانمان بوو.

دایکم لە پڕ ڕووی کردە ئێمە و وتی:

– بنووسن. ئەو پیاوە هات، بەدەستی ئاماژەی بۆ جێیەکی نادیار کردو دووبارە وتی:"ئایا نابیستن؟ بەئێوە دەڵێ".

– کێ دایکە؟ کام پیاو؟ ئێمە هیچ شتێك نابینین...

– ئەو پیاوە، ئەو پیاوە. موبارەکە... ئەو پیاوە نوورانییەی ئێمە لە هەموو تەنگانەیەکدا ڕزگار دەکات...

– کوا؟ لەکوێیە؟ بۆچی ئێمە نایبینین؟

دایکم چاوی بڕییە قوڵاییەکان و ئەوانەی گوێبیستی دەبوو بەئێمەی دەوت.

– ئێوە گرفتاری گوناه و تاوان بوون. ئەو پیاوە نوورانییە چیتر بە هاناتانەوە نایەت. هەرکاتێ تەوبە بکەن و، لەو گێژاوە خۆتان دەرباز بکەن، ئەوا دووبارە دێتەوە بەهاناتانەوە.

ئێستا ئەوەی دەیڵێم بینووسن. زۆرباش گوێ بۆ ئەم وتانە بگرن، دەی خێراکەن، گوێڕایەڵی بکەن، کاتم هێندە بەدەستەوە نەماوە.

براکەم ڕایکرد قەڵەم و کاغەزێکی هێناو، دەستی کرد بە نووسینەوەی ئەوەی دایکم دەیوت..

١– گەر دۆستت دەوێت، پەروەردگارت بەسە.

٢– گەر هاوڕێت دەوێت، قورئانت بەسە.

٣– گەر سامانت دەوێت، قەناعەتت بەسە.

٤– گەر دوژمنت دەوێت، نەفست بەسە.

٥– گەر ئامۆژگاریت دەوێت، مردنت بەسە.

ڕستەگەلێکی زۆر پوخت و، پڕ واتاو، زۆر جوان بوون. بەڕاستی هەرکەسێك لەژیانیدا لەبەرچاویان بگرێت و، پەیڕەویان بکات، بێگومان ئاسوودەیی و خۆشبەختی بەدەست دەهێنێت. بەڵام ئێمە بەجۆرێك سەرگەردان و، کینە لەدڵ بووین، بەهیچ جۆرێك لەحاڵێکی وەهادا نەبووین. ئەم ئامۆژگارییە مەزنانە بەهەند وەربگرین و، جێبەجێیان بکەین.

پاش ئەوەی دایکم ئـەم دێڕانـەی وت، هەستمان کـرد لـە خـاڵێکی دوور دەڕوانێــت، وەك ئــەوەی بــە ئامــانجی ڕاســتەقینەی خــۆی گەیشــتبێت. ڕووخســاری بــە زەردەخەنەیــەکی شــیرین گەشــایەوەو، ویستی دەستەکانی درێژبکات و ئامێزی والا بکـات، بـەڵام بـەهۆی بـێ وزەو تواناییــەوە ســەرکەوتوو نــەبوو. تــا دەهــات ڕووخســاری زیــاتر دەدرەوشایەوەو، تیشکی نووریـنی دەدایەوە. لەوانەیە لـە ژیانیـدا بـۆ یەکەمجار بەو شێوەیە پڕ بە دڵ خۆشحاڵ بووبێت.

من و براکەشم لە نزیکی دایکمانەوە دانیشتبووین و، بە ســەرنجەوە لەم حاڵەمان دەڕوانی.

ئەم ئافرەتە ماندوونەناسەی لە سەختترین کاتدا ئێمەی لە سـایەی خۆیدا پاراسـت، سـەرەڕای ئـەو هـەموو چەرمەسـەرییەی چەشـتمان، هــەرگیز جارێـك ناشـکوریەکی نـەکرد و، چارەنووســی ســپاردووە بــە پەروەردگاری. کە هەموو ئەمانەم هێنایەوە پێش چاوم، دڵنیابووم کە دایکم لە دواساتەکانی ژیانیدایەو، جارێکی تر ناگەڕێتەوە لامان. ئـەی هاوار، دەبێت سەرەمەرگی ئێمە چۆن بێت؟ چۆن دەچینەوە بارەگای پـەروەردگارمان؟ ئـەی ئەگـەر لـە سـاتی سـەرەمەرگماندا لـە ڕێبـازی پـەروەردگار دووربـین؟ ئـەی ئەگـەر ئێمـە ئیمانمـان لەدەسـت بـدەین چی؟ تەنانەت بیرکردنەوەش لەمە مرۆڤی ڕادەچڵەکاند؟

کۆتا وتەکانی دایکی خوالێخۆشبووم: "الله، لا إله إلا الله" بوو.

له جێگەکەیدا سەری نایەوە، خۆ هەرچەندە نەیتوانی دەستەکانی بە تـەواوی بەرزبکاتـەوە، بـەڵام وەك بـە دوعـا خوێنـدن ماڵئـاوایی لێ کردین، ژیـانێکی ئـاوێزان بـە مەینـەتی و دەردی سـەری و سـەختیی، دواجـار بـە پایـان گەیشـت، ناڵـەو ئازارەکـانی تـەواوبوون و، وەرزی تەمەنی کۆتایی هات.

ئەو چووە بارەگای پەروەردگاری و، بە ئاسوودەیی شادبوو.

ئـەی چارەنووسـی ئێمـە چـی دەبێـت؟ هێشـتا دەردی سـەری و مەینەتیەکانمان بەردەوام بوون.

دایکیشمیان بە خاك سپارد.

## خەونێکی پڕ پەند:

چەند ڕۆژێك دوای بەخاکسپاردنی دایکم، لە خەونمدا بینیم.

لەشوێنێکی زۆر خۆش بوو. لە قەتپاڵی چیایەکدا، لـە باخچـەیەکی زۆر ڕازاوەو دڵڕفێنـدا بـوو. کەسـانێکی زۆر لـە دەوری بـوون، کـە لام ئاشـنا نـەبوون، خوشکەکەشـم شانبەشـانی دایکـم بـوو. باوەشـم بـە دایکمدا کرد، هەسـتم کـرد بـۆنی کـردم، پاشـان ماچـی کـردم، بـەڵام نـەمتوانی لەگـەڵ خوشـکەکەمدا قسـە بکـەم، ئـەو زۆر لـەدوورەوە بوو.وتی:

– ڕۆڵە گیـان، مـن و خوشـکەکەت زۆر باشـین، هەمیشـە دوعـا بـۆ ئێوە دەکەین.

پرسیم کە بۆچی خوشکەکەم نایەتە لامان، وتی:

– ئەو شەرم دەکات، هێشتا ئەوەی ئەو ناپاکانە بەسەریاندا هێنا، لەیادی نەکردووە، بەڵام پەروەردگار پاداشتێکی بێ پایانی پێ بەخشی و، لە پلەیەکی زۆر بەرزدایە.

دیاربوو باسی هەندێ شتی تریشی بۆ کردبووم، بەڵام من هەر ئەوەندەم لەیادە.

دایکم و خوشکەکەم هەردووک ستەم لێکراو بوون، بۆیە پێم وایە خوای گەورە پلەیەکی بەرزو بڵندی پێ بەخشیون و، بێگومان لە میهرو بەزەیی خۆی بێ بەشیان ناکات. سەرەڕای ئەم هەموو ڕووداو و پێشهاتە ئاگادارکەرەوانەی کە جۆرێك بوون لە ڕێنموویی کردن بۆ ئێمە، بەڵام دواجار نەمانتوانی بەندەیەکی باش بین بۆ پەروەردگار، نەمانتوانی لەسەر ڕێگەی دایکم بین، زۆر هەوڵماندا بۆ دەسپێکی نوێ و، زۆر پاڕاینەوە، بەڵام بەداخەوە هەموو کات بەڵایەکی تر بەچۆکیدا دەهێناین و، ورەمان دەڕوخاو، ڕێی هەڵەمان دەگرتەوەبەر.

## ئەو نەهامەتیەی دوا تروسکەی ئومێدی ژیانی لێ خامۆش کردم:

هەموو ئازارێك، هەموو ناڕەحەتییەك کە دووچاری دەهاتین، ئیمانی لە ناخمدا کاڵتر دەکردەوەو، زیاتر لە زەلکاوی خراپەو تاواندا نوقمی دەکردین.

ئەندامانی خێزانەکەم یەکە بە یەکە کۆچی دواییان کردو، لەگەڵ براکەمدا وەك هاوڕێیی گیانی بووین بۆ یەکتری. بەڵام دیارە ئەو دڕندانە ئەم تاقە ئومێدەشیان پێ ڕەوا نەبینیم و، لێیان زەوت کردم. ئەو برایەشم کە دوایین هاوسەفەری ڕێم بوو، تەنیا جێی هێشتم.

پاش مەرگی دایکم لەگەڵ براکەمدا بەتەواوی خۆمان یەکلایی کردبووەوەو، تەنها بۆ یەك ئامانج دەکۆشاین: تۆڵەسەندنەوە لە دوژمنەکانمان.

ڕۆژێك نەخۆش کەوتم و ناچار لەماڵەوە مامەوە پشوو بدەم، براکەشم بە تەنیا چوو بۆ ئیش. پاش نیوەڕۆ دەرمانم خواردبوو، دیاربوو هێورکەرەوەبوو و، منی خەواندبوو، کە چاوم کردەوە هەستم کرد کات نزیکەی نیوەی شەوە. لە دەوری خۆم ڕوانی، بەڵام براکەم نەبینی.

سەرەڕای سەرئێشەو نەخۆشی دەستبەجێ لە جێگەکەم هەستام، تا بەدوای براکەمدا بگەڕێم، ئەو شوێنانە گەڕام کە گومانم برد لەوێ بێت، بەڵام خۆ بەبێ من بۆ هیچ شوێنێك نەدەڕۆیشت و، پەیوەندیشی لەگەڵ کەسدا نەبوو، بەڵکو باشترین و نزیکترین هاوڕێی نهێنی پارێز و، هاوبەشی خەمم بوو. هەردووك بەیەکەوە ڕووبەڕووی سەختیی ڕۆژگار دەبووینەوە.

بەپەلە خۆم گەیاندە بەندینخانە... ئەمجارەش کاکی ئەفسەر زۆر لەگەڵمدا کۆشاو، شوێن نەما بەدوایدا نەگەڕێین و، پرسیاری لەبارەوە نەکەین. نە بەزیندوویی و نە بە مردوویی هەواڵیمان دەست نەکەوت، واتە براکەمیان بێ سەرو شوێن کرد.

لەو ڕۆژەوە هەواڵێك لەبارەی براکەمەوە نازانم.. تا ئێستەش چاوەڕێی گەڕانەوەییم و، لەگەڵ یادگارییەکانی ئەودا دەژیم، ئەو تەواوکاری بوونی من بوو، تەنها هاودەم و کەسم بوو لەم دونیایەدا.

کەسێتی ئەو لە من سەنگینتر و، هێمنتر و، ژیرتر بوو، زۆرجار ئەو لە ڕەفتارە هەڵەشەکان سەرزەنشتی دەکردم، هەڵەو شپرزەیی و توورەییەکەمی کەمتر دەکردەوە. هەمیشە وەك کەسێکی لە تەمەنی خۆی پێگەیشتووتر بیری دەکردەوەو بڕیاری دەدا، تا ئەو ساتەش کە لە من جیابوویەوە، هەوڵی دەدا لە داوی خراپەکارییەوە تێوەنەگلێت، وەك هەر گەنجێکی هاوتەمەنی خۆی، ئەویش هەندێ هەڵەو لادانی هەبوو، بەڵام چەندێك لە توانایدا بووایە هەوڵی دەدا خۆی لە جگەرە کێشان و، مەی خواردنەوەو هەموو خووە خراپەکانی تەمەنی هەرزەکاریی بەدووربگرێت، ماوە ماوە نوێژەکانیشی دەکرد، وەکو من شپرزەو بێ ئامانج و کینە لەدڵ نەبوو.

براکەمیان بێ سەروشوێن کرد، منیش هەموو ڕۆژێکم بە نەفرەتی کردن لە بکوژەکانی ئەو تاوانە بەسەر دەبرد. مەگەر ئەوانە چۆن

مرۆڤێکن کە هێندە لە کوشتن چێژ دەبینن؟ لەم دونیایەدا هیچ دۆستێك و، هیچ کەسێکم نەمابوو دڵی پێ خۆش بکەم و، چرای یەکجاری ژیانم کوژایەوە.

## ئاگری تۆڵەسەندنەوە:

بەبێ سەروشوێن کردنی براکەم، ئاگری تۆڵەسەندنەوە لەناخمدا کڵپەی سەندو، بەهیچ خامۆش نەدەبوو و، تا دەهات زیاتر بڵێسەی دەسەند، لاشەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەم هەمیشە لەپێش چاوم بوون، کە سەراپای ژیانیان لە ترس و دڵەڕاوکێدا بەسەر بردو، لە ئەنجامدا هەموویشیان بوونە قوربانی بێ بەزەیی و دڕندەیی.

باوکم...

دوو براکەم...

خوشکەکەم...

ئەوان بە دڕندەییەکی نامرۆڤانە کوژابوون، تەنانەت ڕێیان نەدا ئابڕومەندانە سەربنێنەوە.

چۆن دەمتوانی چاوپۆشی لەم هەموو ستەمە بکەم؟ بەبێ تۆڵە سەندنەوە؟ ئایا چۆن بمتوانیایە ئۆقرە بگرم و ئاسوودەبم؟!

لەیادبردنەوەی مەحاڵ بوو... دوو هەڵبژاردنم لە پێش بوو: یا هەموو خەونەکانم لە سینەمدا بناشتایەو، چاوەڕێی مەرگم بکردایە، یاخود بۆ کوژاندنەوەی ئاگری تۆڵەسەندنەوە بکوژەکان بکوژمەوە.

ڕێگـە چـارەیەکی تـرم شـك نـەدەبرد، لـەپێناو تۆڵەسـەندنەوەدا ئامادەبووم ژیانم تەرخان بکەم بۆ پلان دانان و، جێهێشتنی شارەکەم و نیشتەجێ بوون لە شارێکی دیکەدا.

قژم درێژکردەوەو، ڕیشم تاشی، چاویلکەم لەچاو کرد، چەند توانیم گۆڕانکـاریم لـە شـێوەمدا کـرد، بـەڵام قاچـێکم کەمئەنـدام بـوو، نەمـدەتوانی گۆڕانکـاری تێـدا بکـەم و، بـۆ هـەرکوێ بچـوومایە دەیانناسیمەوە پێی.

ئەوەش یادگاری دوژمنەکانم بوو بۆ من، دەمتوانی چیم پێ خۆشـە بیکەم، بەڵام کەمئەندامییەکەم کەمێك ناچاری دەکردم بە شەلی بڕۆم، لەو ڕۆژانەدا دوو پلان لە مێشکمدا بوون.

یەکەمیان، ئەنجامدانی دزیەکی باش، بۆ دەست خستنی پارەیەکی زۆر و، سەرچاوەیەکی تەواو، تا بـە ئاسـانی دوژمنـەکانم بدۆزمـەوەو، لەناویان بەرم.

دووەمیشیان، نەشـتەرگەریی قاچـە ناتەواوەکـەم و چـاککردنەوەی بوو، کە گەورەترین کۆسپی ڕێی گەنجێتیم بوو، نەمدەتوانی چیتر ئەم ژیانــە بــە کەمئەنــدامیی درێــژە پــێ بــدەم، بــۆ ئــەم ئامانجــەش دەستبەکاربووم.

# بەشی پێنجەم

## ئەو ڕووداوە لەناکاوەی لەماڵەکەدا بەسەرم هات



لەو شارەدا کە بۆی چووم لە ئۆتێلێك نیشتەجێ بووم و، ڕووماڵی ئەو شوێنانەم کرد کە دەگونجا دزی لێ بکرێت، دەمویست بە تەنها خۆم ئەم کارە ئەنجام بدەم و، خۆ ئەگەر مردم ئەوا تەنیا خۆم دەبم و، گەر ڕزگاریشم بووایە بەهەمان شێوە بوو.

ماڵێکی دەوڵەمەندم دۆزیەوە. وا دەردەکەوت چوونە ناوەوە و هاتنە دەرەوەشی ئاسان بێت، بۆیە هەموو وردەکاریەکانی پلانەکەم لەبەرچاو گرت! خراپترین ئەگەر، دەستگیرکردن دەبوو یان بەند دەکرام، یاخود هەر لە ماڵەکەدا دەکوژرام.. هەموو ئەم ئەگەرانە لای من هیچ بایەخێکیان نەبوو.

بەهۆی تاوانەوە زۆر ڕێم کەوتبووە بەندیخانە –جا من ئەنجامم دابێت یاخود نا– لێدان و سزادانم چەشتبوو، تەنانەت ئەوەندە زوو زوو دەچـوومە بەندینخانـەوە، کـە شـێوازەکانی لێپرسـینەوەو پرسـیارکردنم لەبـەرکردبوو. بـۆ مـن قۆڵبەسـت کـردن و بەندینخانـە شتێکی زۆر سانابوو. خۆ هەمووومان هەر دەبێت بمرین.

ژیان و مەرگم چ جیاوازییەك دەهێننە ئاراوە؟! ئەو ڕووداوانـەی لـە ژیانمدا بەسەرمدا هـاتبوون، واتـای مـەرگی زۆر لا سـانا کردبوومـەوە، مەرگ بۆ من ڕزگاربوونێك بوو. خۆ زۆرجاران ویستبووم بمرم و ڕزگارم بێت، بە هیچ جۆرێك لە مەرگ نەدەسڵەمیمەوە.

شەوێك چوومە ماڵەکەوە، لەڕاستیدا زۆر بە ئاسـانیی تـوانیم بچمە ژوورەوە، بەڵام لـەناکاو کـە خـۆم لـە ماڵەکـەدا بینییـەوە، لەڕاسـتیدا شڵەژام، بەڵام چەکم پێ بوو و، ئامادەبووم بۆ پێکانی هەرکەسێك کـە دەهاتە بەردەمم، سەیری چـەند ژوورێکـم کـرد، بـەڵام نـەمتوانی هـیچ بدۆزمەوە، بـۆ گەیشـتن بـە ئاڵتونـەکان بڕیارمـدابوو کـە بچـمە ژووری نووستنەکەو، هەڕەشە لە خاوەن ماڵەکە بکەم، تا هەرچی هەیـە پـێم بدات، بەڵام ماڵەکە تاریك بوو، بە ئەستەم شتێك دەبینرا.

چوومە ژووری نووستنەکەوە، بینیم گڵۆپی ژوورەکـە داگیرسـابوو، بەڵام جێگە خەوەکە خاڵی بـوو، بـەڵام ژوورەکـە پـەرش و بـڵاو بـوو، وەك ئەوەی هەستیان بە مەترسی دزێك کردبوو، بۆیـە کـەمێك دوودڵ

بووم، بەڵام لەو ساتەدا بە توندی زەبرێك بە پشتە ملم گەیەنرا. هەر ئەوەندەم لەیادە، کە لە هۆش خۆم چووم.

## لەچاوەڕانی مەرگدا:

کە چاوم کردەوە، پیاو و ژنێك لەسەر سەرمەوە وەستا بوون، بەڵام دەست و قاچەکانم بەسترابوونەوە. پیاوەکە دەستەکانمی کردەوە، کە بە ئاگاهاتمەوەو، هەستم کرد کە چەکەکەم و چەقۆکەم پێ نەماوە. تاوێك پیاوەکە لێی ڕوانیم. لەڕاستیدا لەم حاڵەی خۆم شەرمەزاربوو‌بووم. لە هەمان کاتدا حەیفیشم لێدەهات. بەڵام ڕەفتاری نەرم و نیانیی پیاوەکە بەتەواوی مایەی سەرسوڕمانم بوو. پرسیاری کرد:

– بۆچی ئەم کارەت کرد؟

دەمویست ئەوەندە بەتوندیی وەڵامی بدەمەوە، کە ڕاستەوخۆ ڕاپێچی بەندینخانەم بکات. نەمدەویست لەوە زیاتر لەبەرچاویدا بچووك بێمە پێش چاو.

– دزی بۆچی دەکرێت؟ پارە پەیداکردن، دەوڵەمەندبوون، مانەوە لە ژیاندا..

– ئەمەش ڕێگەیەکی دروست و ئەخلاقیانەی خۆی هەیە. کار بکەو بەڕەنجی شانی خۆت دەوڵەمەند ببە، بۆچی ئارامیی خەڵکان دەشێوێنیت؟

– ژیان زۆر بە زیادەوە ئارامیی منی تێکداوە... با تۆزێکیش ئارامیی ئێوەی دەوڵەمەند بشێوێت.

– بەڵام تۆ لەپەروەردگار ناترسی؟ ئایا هەست ناکەیت لەسەر ئەم کارەت هیچ لێپرسینەوەیەکت لەگەڵدا بکرێت؟

– من باوەڕ بەو شتانە ناکەم.

پیاوەکە هەڵوێستەیەکی کرد، بەخەندەیەکی متمانە ئامێزەوە چاوی بڕیە چاوم و وتی:

– دەزانی هیچ سەرکەوتوو نیت لە درۆ کردندا.

– جا تۆ لەکوێوە دەزانی کە درۆ دەکەم؟!

– وتی من دەروونناسم، لەهەڵسوکەوتی مرۆڤەکە و شێوازی قسەکردنیەوە هەڵکەوتەی ڕۆحی دەزانم.

زمانت شتێك و ڕووخسارت شتێکی تر دەڵێن، ئەم پیاوە بەتەواوی ناخمی دەخوێندەوە.

– سەیرکە، بەهۆی شەمەزاریتەوە ڕەنگت سوور هەڵگەڕاوەو، ئارەق دەڕێژێت. کەسێك بەویستی خۆی ئەم کارە بکات و، خوای گەورەی لەیادکردبێت، شەرم دایناگرێ.

– نەخێر، تۆ بەهەڵە تێگەیشتوویت.

– هەڵە نیە، ڕاستە...ئەو جەوشەنەی بە ملتەوە هەڵواسراوە، زۆر باش کەسێتیت ئاشکرا دەکات.

تۆ ئەم كارە بەخواستی خۆت ناكەیت. هەرگیز ناتوانیت من بخڵەتێنیت.

پیاوەكە ڕاستی دەوت، وەك ئەوەی من بناسێت. جەوشەنەكەی ملیشم یادگاری دایكی ڕەحمەتیم بوو. بەڕاستی هەستمكرد ویردەكانی ئەم جەوشەنە منی لە زۆر هەڵە ڕزگار كرد.

پیاوەكە قاچەكانیشمی كردەوە و، بانگهێشتی كردم بۆ سەر مێزی نانخواردن، پاش كەمێك هاوسەرەكەی نانی بەیانی حازركرد و هێنای. هەرسێكیشمان لەسەر هەمان مێز دانیشتین.

من لە بەرامبەر ئەم ڕەفتارە مرۆڤانەیاندا شەرمەزارو خەجاڵەت بووبووم و، بۆ ئەوەی ساتێك زووتر بچمە دەرەوە و، دەرباز ببم، زۆر هەوڵمدا، بەڵام ڕێیان نەدام و، پیاوەكەوە وتی: دەرگاو پەنجەرەكان داخراون و، كلیل دراون، ناتوانیت بۆ هیچ شوێنێك بچیت، شتانێك هەیە دەبێت لەگەڵ تۆدا باسیان بكەم.

مەترسە، ڕاپێچی پۆلیست ناكەم، بەڵام پێویستە پەی بەو نهێنییە بەرم كە لە ناختدایە. تۆ كەسێكی خراپ نیت و، زۆر مەراقی زانینی هۆكاری ئەم لادانەت دەكەم.

– وازم لێبێنن، مەراقی چی دەكەی؟ هاتمە ناو ماڵەكەتانەوە بۆ دزی و، ئێوەش دەستگیرتان كردم. مافی خۆتانە هەرچییەك بكەن، جا لێم دەدەن، یا سكاڵام لەسەر تۆمار دەكەن؟ چی دەكەن بیكەن؟

- نەخێر ئێمە کەسانێکی هەبووین و، تۆش مرۆڤێکی ستەمدیدەو بێچـارەیت. دابینکردنـی پێویسـتیەکانت ئـەرکی ئێمەیـە. بـەڵام دەمانەوێت پێویستیی ڕاستەقینەو پاڵنەرەکەت بزانین و، یارمەتیت بدەین.

ئـای خوایـە گیـان! ئایـا کەسـانی وەهـاش لـەم دنیایـەدا دەژیـن؟ لـەنیوە شـەودا هەڵمکوتاوەتـە سـەرماڵیـان و، لەوانـەش بـوو ببمـە هۆکاری گیـان لەدەسـتدانی، بـەڵام هێشـتا لەلایەنـە باشـەکەیەوە لـە ڕووداوەکەی دەڕوانی و، هەوڵی دەدا یارمـەتیم بـدات، خۆزگـە هـەموو دەوڵەمەندەکان بەم جۆرە دەبـوون، ئـەوکات نـە تـاوان، نـە تاوانبـار دەمان، نە هیچ کەسێك بە ناپاکی گۆش دەبوو.

دەستم کرد بە باسکردنی بەسەرهاتی ژیانم بۆ ئـەم کەسانەی کـە وەك دزێك نا، بەڵکو وەك میوانێـك هەڵسوکەوتیان لەگـەڵ کـردم. مـن هـەر ڕووداوێکـی مەرگـە سـاتی ژیـانم بـە فرمێسـکەوە دەگێڕایـەوەو، ئەوانیش بە فرمێسکەوە گوێیان لێ دەگرتم.

ئای خانمی ماڵەکە، ژنێکی چـەندە میهرەبـان و بەسـۆز بـوو! کـە باسی دایکم و، خوشکەکەم کرد، بەدەم هەنسکەوە ئەوێی جێهێشـت. بەهەمان شـێوەش پیـاوی ماڵەکـە زۆر بـە باسـەکە کاریگـەربوو بـوو، بەهۆی ئەو ڕووداوانەی باسمکردن زۆرباش لـە هۆکـاری دزیکردنەکـەم تێگەیشتبوون.

**میهرەبانیش تا ئەو ڕادەیە:**

ئەو پیاوەو هاوسەرەکەی دڵسۆزانە دەیانویست ڕزگارم بکەن و، لەم زەلکاوە دەرم بهێنن، خاوەن ماڵەکە دەیوت:

– پەروەردگار پەنجەرەیەکی میهرەبانی بەڕووتا واڵاکردو، هەلێکی تری پێ بەخشیتەوە، بۆیە بە باشی سوودی لێ ببینە، با ئەمە ببێتە خاڵی وەرچەرخانی ژیانت، پێویستە زۆر بە باشیی گوێ بۆ ئامۆژگارییەکانی ئێمە بگریت و، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ گرفتاری خراپەو تاوان نەبیتەوەو، ژیانێکی ئاسوودەو ئارام دەستەبەر بکەیت.

ئێمە کوڕێک و، کچێکمان هەبوو و، زۆر دەوڵەمەندبووین، لە خۆشگوزەرانیدا دەژیاین، ڕاستی مەرگمان لەیادکردبوو، باوەڕمان نەدەکرد ڕۆژێك پیر ببین. بەردەوام لە کەیف و خۆشیدا ڕۆژگارمان بەڕێ دەکرد، بەڵام خوای گەورە ماوە ماوە زللەی میهرەبانی خۆی لە بەندەکانی دەدات، تا وانەی پڕپەند فێری ئەو بەندانەی بکات، کە ئەویان لەیادکردووەو، ڕێی سەرگەردانییان گرتووەتەبەر، بەڵکو بە ئاگابێنەوە.

دوو ساڵ لەمەوپێش، خێزانەکە لەڕێی گەڕانەوەماندا لە پشوویەکی خێزانی، دووچاری ڕووداوی پێکدادانی ئۆتۆمبێل هاتین، کچە حەڤدە ساڵانەکەمان و کوڕە نۆزدە ساڵانەکەمان لە شوێنی ڕووداوەکە بەڕەحمەت چوون.

مـن و خێزانیشـم بـە سـەختی برینـداربووین و، ماوەیـەکی زۆر چارەسەرمان وەرگرت و، پەروەردگارم شیفای داین.

ئەمە بوو بە تاقیکردنەوەیەك زۆر پڕپەند بـوو. وەك ئـەوەی خـوای گەورە پێمان بفەرموێت:"ئاگاداربن، ئەرك و مافی ئێوە لـەم دنیایـەدا تـەنیا خـۆش ڕابـواردن و کـەیف و خۆشـی نییـە، ئـەو سـامانەش بـۆ بـەفیڕۆدان لـەکاری نەشـیاودا پێتـان نەبەخشـراوەو، مـافی هـەژارو بێکەسانی تێدایە.

ئەم ژیانەش ڕۆژێك کۆتایی دێت و، لێپرسینەوەیەکی گەورە دەست پێدەکات، دەسا تێشـووی خۆتـان بـۆ ئـەو ڕۆژە ئامـادە بکـەن و، بـە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی کـە ڕەنگـە لـە هـەر سـاتێکدا ژیانتـان کۆتـایی پـێ بێـت، باشـتروایە سـەرلەنوێ چـاو بـە بەندایەتیتانـدا بخشـێننەوە، کـە دڵنیـان پـاش مـەرگ دادگـای بـاڵای خـوایی سـازدەدرێت.. کەواتـە تـا چـەند ئامادەکاریتـان بـۆ ئـەو دادگاییـە کردووە؟

وتەکانی ئەو پیـاوە هـەمووی ڕاسـت بـوون. وادیـاربوو ئـەم مرۆڤـە دیندارو بەئەزموونانە بۆ یارمەتیدانی من دڵسۆزانە هەموو یارمەتییەکم پێشکەش بکەن.. پاشان وتی:

– بڕوانـە ئەگـەر ئامۆژگارییـەکانمان جێبـەجێ بکـەیت، ئـەوا هـەتا بتوانین یارمەتیت دەدەین، ئەگەر تۆبـە بکـەیت و، دەسـت لـەم کـارە

نەشیاوانەت هەڵبگریت، هەرچی پێداویستی و خەرجیت هەیە بۆتی دابین دەکەین.

خەرجی نەشتەرگەرییەکەی قاچت دەدەین، پاشان کارت بۆ دەستەبەر دەکەین، إن شاء الله لانەیەکی ئاسوودەت بۆ دەسازێنم، بەمەش هەم تۆ ڕزگارت دەبێت و، هەم ئێمەش ئاسوودە دەبین کە کارێکی باشمان کردووە.

ئەمانە چەند ڕاسپاردەیەکی سەیربوون، بەڕاستی هەلی لەم جۆرە بە ئاسانی نایەتە ڕێی هەموو کەسێك، پەروەردگار دەرفەتێکی زۆر تایبەتی پێ بەخشیبووم. ڕەنگە ئەوە وەڵامی دوعاکانی دایکم بووبێت، بۆیە نەدەکرا هەلێکی ئاوا زێڕین وەلا بنێم. خۆ ڕەنگە ئەگەر ئەمەم لەدەست بچێت، ئیتر تروسکەیەکی هیوا لە ژیانمدا نەمێنێت، بۆیە تێگەیشتم کە ئەوە کۆتا دەرفەتی ژیانمە.

خۆزگە ئەو هەستی تۆڵەسەندنەوەیە لەناخمدا نەدەماو، ئەو تاوانە دڕندانانەم لەیاد نەدەما، تا خەیاڵم ئاسوودەبێت.

سەرەڕای ئەم هەموو یادەوەری و خەیاڵانەم، ڕەفتاری دۆستانەی ئەم ژن و مێردە بەرامبەرم، ئەوەندە دڵسۆزانەو پاك و بێگەردبوو، کە هەموو ڕۆژێك زیاتر منیان وابەستەی خۆیان دەکرد.

ئەو کەسە بەرز دەنرخێنن کە بە نیازی دزی لە ماڵەکەیاندا گرتیان و، لە ماڵەکەی خۆیاندا نیشتەجێی دەکەن، بەڕاستی ئەمە شتێکی

زۆر سەرسوڕهێنەر بوو! پەروەردگار چەندە بەندەی بەڕەوشت و دڵپاکی هەیە، تا ئەمڕۆ دوژمنەکانمان بواریان نەدابووین کەسی باش بناسین و، لە جوانییەکانی دەورمان چێژ ببینین.

لە ماڵەکەی خۆیاندا ژوورێکیان بۆ تەرخان کردم و، جلوبەرگیان پێدام، ئەو مامە میهرەبانە هەموو ڕۆژێك بەپێی پێویست لەسەر مێزەکەم خەرجی بۆ دادەنام و، بەڕاستی لەپێناو گەڕانەوەمدا بۆ سەر ڕێی ڕاست درێغییان نەدەکرد.

خانمی هاوسەریشی زۆر بەسۆزو میهرەبان بوو و، خواردنی خۆشی بۆ دروست دەکردم و، وەك مرۆڤێکی ئاسایی میوانداریيان لێ نەدەکردم، بەڵکو وەك ئەوەی جگەرگۆشە کۆچکردووەکەیان بم.

هێواش هێواش لە کەناری ئارامیی نزیك دەبوومەوەو، خۆشڕەفتاری و میهرەبانیی ئەوان لە هەست و بیرکردنەوەکانمدا کاریگەری دەردەکەوت. لەدوای نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتوو شکستییەکەی قاچم باشتر بوو و، لەو بارقورسییەش ڕزگارم بوو، ئیتر دەمتوانی بەڕێکی ڕابوەستم و، هیچ شەلیەکیش لەڕۆیشتنمدا نەما.

مامە دڵسۆزەکە ئیشێکی باشیشی بۆ دۆزیمەوە، کە بۆ ئەو ڕۆژگارە داهاتێکی باشی هەبوو. هانی دەدام لە کارەکەمدا پشت

بـەخۆم ببەسـتم و زۆر وابەسـتەی ئـەو نـەبم، بـۆ ئـەوەی ژیـانێکی سەربەرزانە دەستەبەر بکەم.

کەسانێکی وەها پـاك و بێگـەردو دڵسـۆز بـوون، کـە زیـاتر لـە دوو فریشـتـە دەچـوون، کـە بـۆ مـن بووبێتنـە پەروانـە. وەك منـداڵی ڕاستەقینەی خۆیان، بە ئەندازەی کوڕە خوالێخۆشـبووەکەیان منیـان خۆشدەویست و، خەمخۆرم بوون.

ئەو پیاوە میهرەبانە چـەندین پـرۆژەی لـە خەیاڵدا بـوو بـۆم، ئـەو دەیویسـت مـاڵێکی جـوانم بـۆ دابـین بکـات و، ژنم بـۆ بهێنێـت و، خێزانێکی خنجیلە پێکبهێنم. هەموو ئەمانەش ئاگری تۆڵەسەندنەوەی نـاخمی تـا ڕادەیـەك کـەم کردبـۆوە و، بـۆ مـاوەی سـاڵێك، ئـارامترین ڕۆژەکانی تەمەنم ژیام.

## هەواڵێکی خراپ:

لــەدوای مــەرگی بــاوکی خوالێخۆشــبووم، چــوار پێــنج خزممــان بەزیندوویی مابوونەوە، یەکێك لەمانەش مـامم بـوو. مـامم پەیوەنـدی لەگــەڵ ئێمــە پچــڕاندبوو، ســۆراخی نــەدەکردین، ئێمــەش بــەهۆی توڕەییمانــەوە، ئــیتر پــاش ئــەوە هــەواڵیمان نەپرســیبوو، واتــە خزمایەتیمان سڕیبوونەوە.

ساڵەهای سـاڵیش بارودۆخەکـە بـەم جـۆرە بـوو، لەڕۆژگارە زۆر سـەخت و پڕنەهامەتییەکانمانـدا بــە هانامانــەوە نــەهاتبوو. بــەڵام

بێگومان هەر بەڵایەك بەسەریدا بهاتایە، دڵگراین دەبووین، هەر بەم شێوەیەش بوو.

ڕۆژێکی یەکشەممە، پەیوەندیم بە هاوڕێیەکمەوە لە ناوچەکەی خۆمان کرد، هیچ کەس لە هاوڕێکانم نەیاندەزانی من لەکوێم، بێگومان نەموت لەکام شارەوە پەیوەندیی دەکەم.

لەدوای هەواڵ پرسین، پرسی:

– تۆ هەواڵی ئەو ڕووداوەت نەبیستووە، وانیە؟!.

– وتم کام ڕووداو؟.

– کاتێك مامت بەڕێیەکدا ڕۆیشتووە، ئۆتۆمبێلێك لێی داوە.

– مردووە؟

– بەڵێ.

بەم هەواڵە زۆر بێتاقەت بووم، ئەو هەستی تۆڵەسەندنەوەیە بڵێسەی سەند، کە ماوەیەکی کورت بوو لەیادم کردبوو. دڕندەی وەك ئەو دوژمنانەی ئێمە ئۆقرەگرتنیان نەدەزانی، ئاشکرا بوو هەتا کەسێك لە ئێمە لە ژیاندا بمایە، لە تاوان و کوشتنیان بەردەوام دەبوون.

پێویست بوو سنوورێك بۆ ئەم دەریای خوێنە دابنرێت و، چارەیەکی یەکلاییکەرەوە بۆ ئەم بارە بدۆزرێتەوە، پرسیم:

– ئەمە تازە ڕووی داوە؟ وتی:

– مانگێك لەمەوپێش، کارەکە لێرەدا تەواونابێت.

– چۆن؟

– ڕۆژێك پێش مردنی مامت، چوونەتە ماڵەکەی و بە هەڕەشەوە پرسیاری تۆیان کردووە، کە مامی بەستەزمانیشت وتویەتی نازانم، زۆریان لێداوە.

کە ئەمانەم گوێ لێبوو، ڕووخام، ئیتر توانای لەیادبردنەوەم نەماو، هەموو باشی و جوانییەکان سەرلەنوێ لەبەرچاوم سڕانەوە، سەختگیرانە خەیاڵی تۆڵەسەندنەوەم کردو، هێواش هێواش لاسارییەکانم بە خەیاڵدا هاتنەوە.

بەم شێوەیەش ڕۆژە ئاسوودەو ئارامەکانم کۆتاییان پێ هات و، چیتر هیچ کەسێك نەیدەتوانی پێشم لێ بگرێت و، هەموو ئەو بەخششە خواییانەو، ئەو ڕۆژە خۆشانەو، داهاتووی ئارام و، دەستپێکی نوێم بەبادا.

بەو بڕە پارەیەی کە کۆمکردبوویەوە،چەکێکم کڕی و، ئەوەش کە مایەوە بۆ خەرجی خۆم خستمە گیرفانم و، بڕیاری کۆتاییمدا.

## بەرەو مەرگ هەنگاوم دەنا:

چیتر نەمدەتوانی بەئاسوودەیی بژیم، مرۆڤێك بووم کەبەرەو مەرگ دەڕۆیشتم، کەسێك خۆی بۆ مەرگ ئامادەبکات، لەچی دەترسێت؟ بێگومان لە هیچ شتێك...

بەبێ ئاگاداركردنەوەی مامە دڵسۆزەكەو هاوسەرەكەی، بەبێ ماڵئاوایی لەو كەسانەی متمانەیان پێكردم، چاكەیان لەگەڵ كردم، یارمەتییان دام، دنیایەكی نوێیان بۆ سازاندم، ڕۆیشتم، ئەو كارە پێویست بوو تا بتوانرێت زووتر یەكلایی بكرێتەوە.

دڵنیابووم من بەدەستی خۆم مەرگم هەڵبژاردبوو و، دونیایەكی زۆر بەختەوەرم لەخۆم شێواندبوو، لەوەش گرنگتر بەدەستی خۆم هەستی جوانی و چاكی و ئیمان و باوەڕم لەناخمدا ڕیشەكێش كردبوو. دیسان خۆم گرفتاری هەستی پیاوكوژیی و دوژمنایەتی كردن كردبوو.

تەنانەت لەڕێگەی مەستیی و مەی خواردنەوەو سەركەشیدا بەرەو پێش دەچووم، ڕق و كینەو تۆڵەی كپكردووی چەند ساڵەی ناخم منی ئامادە كردبوو. خۆم بۆ ئەنجامدانی هەموو جۆرە خراپەیەك ئامادەكردبوو.

دڵنیاش بووم كە چیتر پەروەردگار دەرفەتی گەڕانەوەو تەوبەكردنی دیكەم پێ نابەخشێت، واتە هەموو باشیەكانی ژیانم لەیادكردو، بەرەو هەڵدێر بەڕێ كەوتم، دەست بە چەك و بیروهۆشی پەرش و بڵاو و، كینە لەدڵ و، چاو لە تۆڵە بەرەو ڕووی مەرگ دەچووم.

چارەنووسیشم پاش تۆڵەسەندنەوەم زۆر تاربوو، یا مەرگ، یاخود تەمەنێك سەختیی كێشان لە بەندینخانە.. پاش هەموو ئەمانەش لێپرسینەوەی خوایی لەسەر ئەو خوێنەی ڕشتوومە...

هەریەك لەمانەش چارەنووسی تاربوون بۆ هەر مرۆڤێكی ئاسایی و، نەدەبوو كە ڕوویان بدایە. بەڵام ئەم دوژمنانە یەخەیان بەرنەدەدام، وادیارە ئەو وتەیەی دەڵێت:"بەناچاریی مرۆڤ دەكەنە پیاوكوژ". بۆ ئەم بارەی من وترابێت.

## بەدوای سۆراخی دوژمنەكانمەوە بووم:

بەشێوەیەكی باش ڕووخسارو شێوەم گۆڕی و، بەنهێنی سۆراخی دوژمنەكانم دەكرد. مەحاڵ بوو بمناسنەوە، چاكبوونەوەی قاچیشم، كارەكەمی ئاسان كردبوو.

تەنها یەك كەس منی دەناسییەوە ئەویش هاوڕێ (یەڵدارم)ی هاوڕێی منداڵیم بوو و، تەنها كەسیش بوو كە متمانەی پێبكەم، (یەڵدارم) بووە یارمەتیدەری من و، زانیاری بۆ دەهێنام.

لەجوانترین ئوتێلی شارەكەمان نیشتەجێبووم، بەتەواوی وەكو پیاوماقوڵێك دەهاتمە پێش چاو، كارمەندەكانی ئوتێلەكە منیان وەكو پیاوێكی دەسڕۆیشتووی خاوەن كۆمپانیا ناسیبوو، واتە ئیتر بەناویش كەسەكەی جاران نەبووم و، هەموو شتێكم گۆڕابوو.

(یەڵدارم)ی هاوڕێم، کەسێکی وریاو، بە سەرنج بوو، ڕۆژانە زانیاری زۆر بە نرخی بۆ دەهێنام.

پاش ئەوەی زانیاری پێویستمان کۆکردەوە. سێ کەسمان کردە ئامانج، کە پێویست بوو لەناویان بەرین، چونکە دوژمنی سەرەکی بوون و، لە مەرگی ئەندامانی خێزانەکەمدا دەستیان هەبوو، بۆیە پلانێکی توندوتۆڵمان دارشت و، پاش ئامادەکاری تەواو بڕیارماندا دوای دوو ڕۆژ جێبەجێی بکەین.

ئەو شەوەی بڕیاربوو دەستبەکاربین، (یەڵدارم) بە هەناسەبڕکێ هات و، وتی:

– پەروەردگار ویستی لەسەر نیە، دەست بە خوێن سوور بکەین.

پرسیم:

– بۆچی؟

بە سەرسوڕمانەوە سەری ڕاوەشاندو، بە پەشۆکاویی وتی:

– چونکە ئەو سێ کەسەی دوێنێ بڕیارماندا لەناویان بەرین، دووچاری ڕووداوی پێکدادانی ئۆتۆمبێل هاتوون، لەکاتێکدا لەڕێی یەکێك لە گوندەکاندا بوون، –بەمەبەستی ئامادەبوون لە ئاهەنگێکدا– لەو شەش سەرنشینەی لە ئۆتۆمبێلەکەدا گیانیان لەدەست داوە، سیانیان ئەوانەن کەئێمە بە نیازبووین بیانکەینە نیشانە.

لەڕاستیدا ئەم ڕووداوە وەك تیشکێکی میهرەبانیی پەروەردگار بوو، بۆ گێڕانەوەمان لە هەڵدێر.

ئەم ڕووداوە زۆر کاریگەربوو. دەنگێك لەناخمدا هەمیشە منی بەرەو ڕێگای ڕاست ئاڕاستە دەکرد، بەڵام بەداخەوە من گوێم بۆ نەدەگرت و، بایەخم بۆ دانەدەنا.

لایەنی دووەم لە دوژمنەکانماندا (حەمدیە شەل) بوو، کە دەمانویست لەناوی بەرین، بەڵام ئەم پیاوە پیاوێکی زۆر ترسناك بوو و، لە هەموو ناپاکییەکەوە تێوەگلابوو. لە دەوریدا کۆمەڵێکی زۆر پاسەوان و بەکرێگیراوی هەژارو بێکەس هەبوون. ئابڕووی سەدان کەسیی لەکەدارکردبوو، تەنها من ستەمدیدەی دەستی ئەو نەبووم، بەڵکو سەدەها کەسی وەکو من بەئاشکرا حەمدیە شەلی وەك پیاوکوژ دەناسی، بەڵام چارە چی بوو، چونکە ئەوەندە بەباشی دەپارێزرا، کە گەیشتن پێی مەحاڵ بوو.

گەر کەسێك بەرهەڵسی بکردایە، یاخود هەست بکرایە کەسێك نیازی هەیە هەوڵی کوشتنی بدات، هێندە دڕندانە لەناویان دەبرد، تا ببێتە پەند بۆ هەموو لایەك.

زۆر بەباشی دەمزانی چارەنووسی منیش بەو بارەدا دەبەن، بەڵام گرنگ نەبوو، چونکە بە هیچ شێوەیەك لە مەرگ نەدەسڵەمیمەوە،

تەنها شتێك كە لە بیروهۆش و خەیاڵمدابوو دیمەنی لەخوێندا گەوزانی خوشك و براكانم و باوكم بوو.

## پێشهاتێكی زۆر سەرسوڕهێنەری دیكە:

پیلانێكمان بۆ كوشتنی (حەمدیە شەل) داڕشت.

ئەو هەموو ڕۆژێك لە درەنگانی شەودا، دەچووە یانەیەكی شەوانەی بەناوبانگ و، هەتا بەیانی مەی دەخواتەوە. ئێمەش دەمانزانی كە لەبەر نەخۆشی شەكرەكەی زوو زوو دەچێتە تەوالێت، بۆیە پلانەكەمان بەم شێوەیە بوو: من بچمە تەوالێتەكە و، لەوێ خۆمی بۆ مات بدەم تا دێت و، دەستبەجێ دەیكوژم. لەدوای ئەوەش چی دەبێت با ببێت و، هیچ لام گرنگ نەبوو، خراپترین چارەنووس (مەرگێك) دەبێت، هەرچۆنێك بێت من لەمێژە خۆم بۆ مەرگ ئامادەكردووە.

لەكاتی دیاریكراودا بە ناسنامەیەكی ساختەوە، بەناوی بازرگانێكەوە چوومە ژوورەوە بۆ یانەكە. لەبەرئەوەی (حەمدیە شەل)م زۆرباش دەناسی، لەدوورییەوە لەسەر كورسی و مێزێك دانیشتم، بینیم پیاوەكانی وەك پەروانە دەوریانداوەو، ئاشكرابوو كە كارەكەم ئاسان نابێت.

وا خۆم نیشان دەدا لەلایەكی تر بڕوانم، بەڵام لەڕاستیدا چاوم لەسەر (حەمدیە شەل) بوو. پاش كەمێك دانیشتن، چووم بۆ تەوالێت.

بینیم دوو شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن و دەستشۆرێکی لێیە، بۆیە من چوومە یەکێك لە تەوالێتەکانەوەو، دەرگاکەشم کەمێك بە کراوەیی جێهێشت، بۆ ئەوەی ئاگاداری هاتن و نەهاتنی ئەو بم... زۆری نەبرد هات، چووە ئەو لایەی کە چۆڵ بوو، منیش هاتمە دەرەوەو، بەبیانووی دەست شۆردن لەسەر دەستشۆرەکە خۆم سەرقاڵ کرد. پیاوەکانیشی لە دەرەوەی ژووری تەوالێتەکان چاوەڕێیان دەکرد.

دەرگاکە کرایەوەو، هەر کە ویستی بێتە دەرەوە، دەستم برد بۆ دەمانچەکەم، بەڵام هێشتا دەمانچەکەم ئاراستەی نەکردبوو، تەپ کەوت بە زەوییەکەدا، پیاوەکانیشی دەستبەجێ هاتن و، لاشەکەی (حەمدیە شال)یان هەڵگرت و، کە منیشیان لەوێدا بینی، قۆڵبەستیان کردم. پرسیان:

– تۆ کوشتت؟

وتم:

– نەخێر، من دەستم دەشت. بێگومان کە چەکیان پێ بینیم کەوتنە گومانەوە، بەڵام نەیانتوانی هیچ شتێك بسەلمێنن، چونکە ئاسەواری گوللەیەك یا پیاکێشان یاخود خنکاندن بەلاشەیەوە نەبوو.

پۆلیسەکان هاتن و، قۆڵبەستیان کردم، جارێکی تر لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردم و، سەلماندیان کە پێناسەکەم ساختەیە، ئاشکراش بوو کە (حەمدیە شەل) بەهۆی جەڵدەیەکی دڵەوە مردبوو.

ئازارو ئاشکەنجەیەکی زۆریان دام، منیش ئەو شتانەی ڕوویانـدابوو وەکو خۆی دانم پێدانان، دادگا حوکمی زینـدانی کردنـی بەسـەردادام، بەهۆی تاوانەکانی بەکارهێنانی پێناسی ساختەو، هـەڵگرتنی چەکی بێ مۆڵەت و هەوڵی کوشتنەوە. سەرلەنوێ زیندان بووە لانەم... بەڵام ئەمە بۆ من جەژن و ئاهـەنگ بـوو، بـەبێ ئـەوەی دەسـتم بـە خـوێنی کەس سووربێت و، بەشـێوەیەکی زۆر بێوێنـە سـەرجەمی دوژمنـەکانم لەناچوون.

هـەوڵی ڕەشـی تۆڵەسـەندنەوەو یـاخیبوونی ژیـانم ڕەویـەوە، هـەم نەشبوومە پیاوکوژ، بەم جۆرە ئاگری ڕق و کینەی ناخم خامۆش بوو، کە ساڵانێك بوو ناخمی دەسـووتاند. وەك ئـەوەی سـەرلەنوێ لـەدایك بووبێتمـەوە، لەبەرئـەوەش سـەختیی سـزای زینـدان زۆر هەراسـانی نەدەکردم.

ئەگەر بووبوومایەتە پیاوکوژ، هەرگیز ویـژدانم ئاسـوودە نـەدەبوو. هەرچەندە ئەوان دوژمنی سەرسەختی من بوون، بـەڵام هەتیوخسـتنی منداڵەکانیان منی زۆر بێتاقەت دەکرد. چونکە مەرگی باوکم لە هەموو شـتێك زیـاتر کاریگـەری لـە کەسـێتی ئێمـە کردبـوو و، برینگـەلێکی لەناخمدا هەڵکۆڵیبوو، کە هەرگیز سارێژ نەدەبوون.

# بەشی شەشەم

## پێشهاتی لەناکاوی زیندان



چوومە زیندانەوەو، کە چـوومە ژووری زیندانییەکەمـەوە دیمـەنێکم بینی کە هیچ بە خەیاڵمدا نەهاتبوو و، بە بینینی واقم ورما.

ژوورێکی گەورە بوو و، بیست کەسیی تێدابوو، بینـیم کـە (نـوری ئێرنی) بەناوبانگی لێیە، کە داستانی سـەر زمـانی شـارەکەمان بـوو، نازناوی (ڤامپیر نوری) بوو.

(ڤـامپیر نـوری) بەتـەنها خـۆی دەوڵـەتێك بـوو. بـە پیـاوانی بەکرێگیراوی کۆڵان و، گەڕەکەکەیەوە، هێزێکی شکست نـەخواردووی بـۆ خـۆی پێکهێنـابوو. جگـە لـەوەش پەیوەنـدی سیاسیشـی هـەبوو، بەڵام دەستگیرکردنی ئەو بەهۆی هەر تاوانێکەوە و هێنانی بۆ زینـدان تەنانەت حوکمدانیشی بە هیچ شێوەیەك بە خەیاڵی کەسدا نـەدەهات.

کەواتــە لــەم دنیایــەدا پۆلیســی بەویــژدان و پــارێزەر و حــاکمی دادپەروەریش هەن. ئەمەش تا ڕادەیەك مرۆڤی ئاسوودە دەکرد.

تاوانێـك نـەمابوو کـە (ڤـامپیر نـوری) ئـەنجامی نـەدابێت، لـە بازرگـانیکردن بـە ئافرەتـەوەو بـەکارهێنانیان بـۆ لەشفرۆشـیی تـا قومارخانـەکان، لـە یانـەی مـەی خواردنـەوەوە تـا بازرگـانی مـادە هۆشبەرەکان، بۆ هەر یەکێك لەم کارانە وەستابوو.

بەوتەی خـەڵکی پیاوێـك بـوو کـە ئـارەزووی لـە هەرچییەك بووایـە ئەنجامی دەدا.

بەهۆی بەندکردنم لە هەمان ژووردا لەگەڵ پیـاوێکی وا بەناوبانگـدا، واقم وڕمابوو و، زۆریش دەترسام، چەند پیاوێکی لەدەور بوو، کـە دە ڕۆژ پێش ئەو هاتبوونە ژوورەکەوە. بێگومان هـەموو زیندانییـەکانیان کردبـووە فەرمانبـەرداری، واتـە وەك شـا و بەڕێوبـەری ژوورەکـە مامەڵەیان دەکرد. بێگومان مانەوەو زیندانیم لە ژوورێکـی وەهـادا بـۆ من شتێکی جیاواز بوو.

نـەدەبوو لـە ڕێـز و حورمـەت زیـاتر هـیچ ڕەفتـارێکی تـر لەئاسـت (ڤامپیر نوری)دا نیشان بدرێت. خۆ لەم ژوورەدا تەنها وتـەو فـەرمانی ئـەو و دەسـت و پێوەنـدەکانی بـەکاربوون، وا دەردەکـەوت کـە ژوورەکـانی دیکـەش تـەنها ئـەو زیندانیانـەی ملکەچـی فەرمانـەکانی ئەوبوون بە ئارامیی و بێ ترس دەژیان.

بێگومان منیش چووم، دەستم ماچ کردو، ڕێز و حورمەتی خۆم بەرامبەری نواند. بەدەنگە تایبەتەکەی خۆی و بەوپەڕی متمانەوە وتی:

– کوڕە تۆ کێی؟

وتم:

– بێناوم گەورەم، گەنجێکی ئەم ناوەم.

– بۆچی تۆیان هێناوەتە ئێرە؟

– لەبەرئەوەی بکوژەکانی باوکمم کوشتەوە...

لەناکاو بە چاوە ڕەش و گەورەکانی سەرنجی دام و، وتی:

– ئاوەها؟.. دیارە گەنجێکی ئازایت؟

– ئەستەغفیروڵڵا گەورەم، لە ئاست ئێوەدا حەدمان نییە، ئەوە چ قسەیەکە.

– بەدڵمیت.. ئەگەر ئاقڵ بیت و، گوێ لە قسە بگریت، پارێزگارییت لێ دەکەم، بەڵام ئەبێت قەت لەخۆم دوورنەکەویتەوە.

– شەرەفمەند ئەبم گەورەم.

یەکەم شەپۆلی ترس تێپەڕی، پاش ئەوە دەبوو بەردەوام وەك سێبەر هاودەمیی (ڤامپیر نووری) بکەم و، ڕێنماییەکانی جێبەجێبکەم و، لە فەرمانی دەرنەچم.

وته و کردارەکانی (ڤامپیر نووری) زۆر خوانەناسانە و، بێ ڕێزانە و، دوور لە هەموو پێوەرێکی ڕەوشت و ئابڕوومەندانە بوون.. هیچ پێوەرێکی وەك: ویژدان و، سۆز و، بەزەیی و، باوەڕ و، لەخواترسیی لەبەرچاو نەدەگرت.

تەنانەت -پاك و بێ گەردی بۆ خوای گەورە- دەیوت: "خوای من پارەیە"، هەر لەپێناو پارەشدا ماف خواردن و ستەم و پیاو کوشتن و ئابڕوولەکەدارکردنی خەڵکیی زۆر لا ئاسایی بوو. کەسێك بە بازرگانیکردن بە مادەهۆشبەرەکان و ژەهراویکردنی گەنجانی نیشتمانەکەی سامانەکەی پێکەوەنابێت، چاوەڕێی چ جۆرە مرۆڤبوون و ویژدان و لەخواترسانێکی لێدەکرێت.

دڵنیانەبووم (ڤامپیر نووری) چەندێك لە زینداندا دەمێنێتەوە، بەڵام تا ئەو لە ژوورەکەدا بووایە، ناچاربووم هاوەڵایەتیی بکەم، بەڵام هەمووان دڵنیابووین کە زۆر نابات ئازادی دەکەن.

## میوانە نوورانییەکانی زیندان:

دوو گەنجی تازە زیندانیکراو ڕەوانەی ژوورەکەی ئێمە کران، بەڵام من بەم گەنجانەم دەوت میوانی لەناکاو، چونکە هیچ نیشانە و ئاسەوارێکی تاوانبارییان پێوە نەدەبینرا، بەڵکو دوو مرۆڤی بەڕێزی خۆشڕەفتاربوون. ئای خوایەگیان، دوو گەنجی فریشتەئاسای ئاوا چۆن گرفتاری ئەمزیندانە بوون؟

ئەم پرسیارە لای (ڤامپیر نووری)ش گەلآڵە بووبوو، بۆیە بانگی کردنە لای خۆی و، لێی پرسین:

– کوڕە ئێوە مامۆستان؟

دوو گەنجەکەش لەیەکیان ڕوانی و، خەندە کەوتە سەرلێویان، پاشان یەکێکیان وتی:

– نەخێر، ئێمە مامۆستا نین.

– باشە کوڕە، بلێن ئێوە کێن؟ بۆچی هێناویاننەتە ئێرە؟ بەڕووکەش لە مرۆڤی پاك و دیندار دەچن.

یەکێکیان –کە کەمێك بالآبەرز بوو– بەهێمنی و بەخەندەوە وتی:

– ئێمەیان وەك میوان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك هێناوەتە ئێرە.

– یەعنی چی وەکو میوان؟!

– دادگاییەکەمان بەردەوامە، بەلآم لەبەرئەوەی هیچ تاوانێکیان بەسەردا نەسەلماندووین، بەم زووانە ئازاد دەکرێین.

(ڤامپیر نووری) لەناکاو تووڕە بوو و، وتی:

– کوڕە ئێوە چی ئەڵێن؟! وەك مەتەڵ قسەمەکەن، لەپێشدا خۆتان بناسێنن، دواتریش باسی تاوانەکەتانمان بۆ بکەن.. بڵێن بزانم.

دیمەنی برۆ ئەستوورەکان و ڕووخساری ترسێنەر و نیگاتیژەکانی چاوە سوورهەڵگەڕاوەکانی (ڤامپیر نووری) هەمووانی دەتۆقاند، بەلآم

ئەم دوو گەنجە هێندە بە هێمنی و لەسەرخۆیی دەدوان، کە لە ڕووخسارییاندا هیچ کاریگەرییەگی ترس و دڵەڕاوکێ و شڵەژان هەست پێ نەدەکرا.

دووبارە گەنجەباڵابەرزەکەیان قسەی کرد و، وتی:

– من ناوم (سەعید)ە، خوێندکاری کۆلێژی پزیشکیم. هاوڕێکەشم ناوی (زوبێر)ە.. خوێندکاری کۆلێژی یاسایە.

هێشتا (سەعید) قسەکەی تەواونەکردبوو، (ڤامپیر نووری) بە سەرسوڕمانەوە وتی:

– بوەستە کوڕم، با تێبگەین. ئێستا تۆ بۆ پزیشکیی و تۆش بۆ پارێزەریی دەخوێنی. وایە؟

(سەعید) بە سەری ئاماژەی بە (بەڵێ) کرد.

– باشە کوڕم، ئێوەی خوێندکار و فێرخواز چ تاوانێکتان کردووە، وا ئێستە لە زیندانـدان؟ بەڕووکەش کوڕی باش دێنەپێشچاوم.. بەڕاستی مەراقمە بزانم تاوانەکەتان چی بووە.

(ڤامپیر نووری) بە پەرۆشیی و سەرسوڕمانەوە بەردەوام بوو لە جگەرەکێشان و، (سەعیدیش) بە شێوازە زۆر شیرین و هێمنەکەی خۆی بەردەوام بوو:

– گەورەم، ئێمە تاوانبار نین. بەهیچ شێوەیەکیش زیانمان بە کەس نەگەیاندووە، چونکە بەپێی بیروباوەڕەکەمان نیشتمان و خاك

و ئـاو و هـەموو مرۆڤـەکانی نێـوی پـیرۆز و بەبایـەخن و، نابێـت هـیچ زیانێکیان پێبگەیەنرێت.

تا دەهات سەرسوڕمانیی (ڤامپیر نووری) زیاتر دەبوو و، وتی:

– ئەی چۆن؟!..

– سـەرەتا ئامـانجی ئێمـە وەك مـرۆڤ سـەرکەوتووییە لـە پسـپۆڕییەکەماندا، تـا سـوود بـە کەسـانی بێچـارە و سـتەمدیدەی کۆمەڵگەکـەمان بگەیـەنین، پاشـان بـەرزڕاگرتن و پـەروەردەکردنی هەستی پێکەوەژیان و نیشمانپەروەریی لە ناخماندا.

(ڤامپیر نووری) بەتەواوی ئـۆقرەی لێـبڕا و بـەدەنگێکی تێکـەڵ بـە تورەیی وتی:

– باشە کوڕە، کەواتە بۆچی ئێوەیان زیندانی کردووە؟ کەسانێکی پاکوبێگەرد و چاکەخواز کاریان بەم زیندانە چییە؟

(سەعید) بە خەندەیەکی شیرینەوە وەڵامی دایەوە و، وتی:

– لەگـەڵ خوێنـدکارەکانی هاوڕێمانـدا بـە مەبەسـتی فراوانکردنـی مـەودای زانیارییمـان و، لـەپێناو دەستخسـتنی وەڵام بـۆ پرسـیارە جەوهەرییەکانی ژیانمان لە کۆتایی هەموو هەفتەیکدا کۆدەبینـەوە و، وانەی تەفسیری قورئانی پیرۆز دەخوێنین.

بەڵام هەندێك لە کاربەدەستان ئەمەیان بەهەڵە لێکداوەتەوە و، دەڵێن: "ئێوە خەریکی کاری تێکدەر و کۆنەپەرستانەن" و، ئێمەیان زیندان کردووە.

(ڤامپیر نووری) لەناکاو برۆکانی هێنایەوە یەك و، وتی:

– ئەم دەوڵەتە چ بەڵایەکی بەسەردا هاتووە؟! وا کەسانێکی وەك ئێوە نیشتمانپەروەر و ڕۆشنبیر دەستگیردەکات؟ ئایا ئەمە لە خۆڕایە، یاخود ئامانجێکی شاراوەیان هەیە؟ لەکاتێکدا دەبینێت وا بە ئاشکرا ئەو کەسانەی کار بۆ ڕووخاندنی دەوڵەت دەکەن، سەرقاڵی کاری تێکدەرانەن! چۆن دەگونجێت ئەم گەنجە دڵسۆز و فێرخوازانە بەهۆی خوێندنەوەی قورئان و وانەی تەفسیر زیندانیی بکرێن! بەڕاستی بەم کارەیان هەڵەیەکی زۆر گەورە دەکەن.

(سەعید) سەرەڕای ئەم هەڵوێستەکردن و پەرۆشییەی (ڤامپیر نووری)، هێمنیی خۆی پاراست و بەردەوام بوو:

– خوودی دەوڵەت خراپ نییە، بەڵکو هەندێك لە کاربەدەستانی دەستڕۆیشتوو بە نیازی خراپەوە دەسەڵاتەکانی دەوڵەت بەکاردێنن.. ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر دەردەکەوێت کە ئێمە بێتاوانین و، تاوانباری ڕاستەقینەش ئەو کەسانەن کە دەسەڵاتەکانی دەوڵەت بۆ مەرامە گڵاوەکانی خۆیان بەکاردێنن. ئەم بەهەڵەداچوونەش بە زەبری هێز

نا، بەڵکو لەڕێی ئاخاوتن و لێکتێگەیشتن و پێشکەشکردنی پێشنیاری گونجاوەوە ڕاست دەکرێتەوە.

(ڤامپیر نووری) هاواری بەسەر پیاوەکانی دەوری کرد:

- بڕۆ کورە، خێرا مێز و کورسی بێنن، ئەم گەنجانە کەسانێکی هەروا ئاسایی نین، وەرن با بە تاقەت بۆی دانیشین و، باسوخواسێ بکەین. خێرا چاش بێنن، هەمووتان وەرن دانیشن.

(ڤامپیر نووری) ئەو گەنجانەی لا خۆشەویست بووبوو، هەر هیچ نەبێت بڕوای وا بوو کە ئەوان کەسانێکی بێ تاوانن، خۆشڕەفتاریی و دڵفراوانیی ئەوانیش هێندەی تر (ڤامپیر نووری) و، تەنانەت ئێمەشیان بۆ لای خۆیان کەمەندکێش کردبوو.

## گفتوگۆ دەستی پێکرد:

مێز و کورسیی ڕیزکران و، هەمووان دانیشتین لەدەوریان، (ڤامپیر نووری) پرسیاری دەکرد و ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە.

- دیارە ئێوە کەسانێکی ڕۆشنبیرن و، وەك ئێمە نەزان و نەخوێندەوار نین و، لە خراپە و تاوانەوە تێوەنەگلاون.. کارتان بە دین و قورئانخوێندنەوە چییە، مەکتەبەکەتان بخوێنن، تا داهاتووی خوێندنتان مسۆگەر بکەن، ئەوە یەکێکتان دەبێتە پزیشك و، ئەوی تریش پارێزەر، سامانێك بۆخۆتان پێك بێنن، تا دەوڵەمەند بن و، چێژ

لـە دنیـا ببیـنن. حـەیف نییـە کەسـانی وەك ئێـوە لـە سوچـی ئـەم زیندانەیا بژین؟

ئەمجارە (زوبێر) وەڵامی دایەوە:

– ئەگـەر مـرۆڤ تـەنها بـۆ چـێژوەرگرتن لـە خۆشـییەکانی ژیـان و، پارەپەیداکردن و خۆشگوزەرانیی بەدیبهێنرایە، قسەکەتان زۆر ڕاسـت دەبـوو، بـەڵام ئامـانج لـە بـوونی مـرۆڤ تێڕامانـە لـە خـوودی خـۆی و بوونەوەرانی ئەم گەردوونەی کە پەروەردگاری فەراهەمی هێنـاوە، تـا بتوانێت بەباشترین شێوە بەندایەتیی بۆ بەدیهێنەری بکات.

(ڤامپیر نووری) بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەوە وتـی:

– ئەو خوێنکارە گەنجانەی مـن دەیانناسـم و لـە کۆلێـژی پلەبـەرز دەخـوێنن، چـێژ لـە هـەموو سـاتێکی ژیانیـان دەبیـنن و، وەك ئێـوە خۆیان گرفتاری پەیامی پەروەردگار و ئیمان و شتی وا ناکەن، باسـی چی خوایەکم بۆ ئەکەن؟ واز لەو دین و ئیمان و بەندایەتییە بێـنن.. لێ گـەڕێن بـا بـە ئـارەزووی خۆمـان لـەم دنیایـەدا بـژین. ئـادەی ئـەو مەسەلەی خوا و ڕۆژی دوایی و ئەو دیـن و ئیمـان و شـتانەی باسـیان دەکـەن، کـێ بینیـونی؟ هـا؟ مـرۆڤ پێویسـتە تـەواوی حـەز و ئارەزووەکانی دەروونی تێربکات.

(ڤامپیر نووری) پیاوێکی بێ دین و ئیمان بوو و، ئەم ڕاستییەشی بەئاشکرا لە هەموو لایەك باسدەکرد، خۆ ئەگەر بێ باوەڕ نەبووایە چۆن دەیتوانی وەها بەو سانایيە ئەو هەموو خەڵکە چارەڕش بکات؟

(زوبێر) زۆر بە هێمنیی و لەسەرخۆیی وەڵامی (ڤامپیر نووری)ی دایەوە:

– مەرگ کۆتایی بەهەموو ئەم حەز و ئارەزوو و گەنجی و کەیفخۆشییە دێنێت، کاتێك مردن دواوێستگەی ئەم دنیایە بێت و، نەخۆشی و پیرییمان لەپێشبێت و، گۆڕ دوامەنزڵگەی هەمووان بێت؛ چۆن دەکرێت بە چاوپۆشیی لە هەموو ئەم ڕاستییانە لە کەیف و سەفای خۆمان بەردەوام بین! مەرگ لە هەرساتێکدا بێت لە خۆشەویست و ئازیز و کەیفخۆشیی و تەندروستی و نیعمەتەکانی دیکەی ئەم ژیانە داماندەبڕێت. پێویستە بزانین وانە و پەند لەم مەرگە چییە، دەنا ئەم تەمەنە کورتخایەنە مرۆڤانەیەمان بەردەوام لە سایەی هەڕەشەی تارمایی مەرگدا بە هەراسانیی دەگوزەرێت.

بەڕێزەکەم مەگەر دەکرێت بە پشتگوێخستنی ئەم ڕاستییانە ژین بکەین و، لە کەیفوخۆشی خۆمان بەردەوام بین؟!.. ئەوەتا لەهەر کوێیەك گۆڕستانێك، یا گۆڕێك، یا لاشەی مردوویەك، تەنانەت کەسێکی نەخۆشیش ببینین، دەستبەجێ تەزوویەکی ساردی ترسێنەر سەراپای بوونمان دادەگرێت و، دیمەنی ڕووخساری واق

ورماو و، لاشەی سارد و بێ گیانی دێتە پێش چاومان. کەوایە ترس لە مەرگ لەساتێکدا تەواوی ئارەزووەکانی ژیان دەکاتە خۆڵەمێشی دڵتەنگیی و ترس و فانییبوون.

ڕووخساری (ڤامپیر نووری) گۆڕا و، بە تێڕامانەوە برۆکانی لەیەك نا و، شپرزەیی و شڵەژان بە جووڵە و هەڵسوکەوتەکانیەوە دەبینران، وەك ئەوەی زۆر دووچاری ئەم دۆخە هاتبێت و، وتی:

– باشە بەڕای ئێوە پێویستە لەم بارەدا چی بکرێت؟

– پێویستە مرۆڤ بەتەواوی خۆی بسپێرێتە دەست قەدەری خوایی و، ئامانجی ڕاستەقینە لە بەدیهێنانی و، وەڵامی پرسیار گەلێکی وەك: (لەکوێوە هاتووە؟ بۆ کوێ دەچێت؟ ئایا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت؟) بزانێت.

## گەر بوونی هەیە، کەواتە پێشانم بدە!

ڕووخساری (ڤامپیر نووری) تا دەهات زیاتر شڵەژان و کاریگەربوونی پێوە دیاریدەدا.

– دووبارە هێناتانەوە سەر خوا، وانیە؟ بەڵام ئەگەر بەڕاستی بوونی هەیە، کەواتە لەکوێیە؟ پیشانم بەن!

ئەم جارە بەتەواوی تووڕەیی لە ڕووخساریی دەباری و، ئێمەش لە سەلامەتی گەنجەکان دەترساین. بەڵام دیاربوو ئەم گەنجانە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دۆخانەدا ئەزموونیان هەبوو و، دەیانزانی

چۆن لەگەڵ هەر کەسێکدا دەدوێن. هەر بەهۆی هەڵسوکەوتی جوان و خوورەفتاری شیرینییانەوە بوو کە توانیبوویان (ڤامپیر نووری) کەمەندکێش بکەن، لەکاتێکدا ئەو ڕێی نەدەدا هیچ کەسێك بەم شێوەیە قسەی بۆ بکات و، ئامۆژگاریی بکات.

پاشان (سەعید) وتی:

– بەڕێزم، بێگومان بە لێکدانەوەی خۆتان شێوازی بیرکردنەوەتان ڕاست و دروستە، چونکە مرۆڤەکان وا دەزانن شێوازی بیرکردنەوەیان هەمیشە دروستە، –ئەگەر بەم شێوەیەش نەبێ ژیان بەردەوام نابێت–، جوانیی و ناوازەیی ژیانیش بە بیرکردنەوە و لێکدانەوەی جیاواز دێتەئاراوە.

ئێستە ئەگەر لەم ژوورەدا هەمووان بیر لە یەك شت بکەنەوە و، هەمان هەستیان هەبێت و، هەمان لێکدانەوە بۆ ڕووداوەکان بکەن، ئەوا هیچ جوانییەك لە ژیاندا نامێنێت، بەڵام بیرکردنەوە و لێکدانەوە و تێڕوانینی جیاواز ڕێگەچارەی جیاواز دێننەکایەوە. بێگومان کاتێك لە کۆمەڵگەدا کەسانی بێ باوەڕ و باوەڕدار و موسوڵمان و ناموسوڵمان هەبن، تێڕوانینیشیان جیاواز دەبێت و، بەمەش چەندین شێوازی ژیان و، بیروبۆچوون بەرهەم دێن. خۆ ئەگەر تەنها یەك جۆر مرۆڤ و، بیرکردنەوە و، تێروانین هەبێت، ئەوا بەتەواوی واتای ژیان لەناو دەبەن و، مرۆڤایەتی بەرەو دۆخی پوچگەرایی ئاڕاستەدەکەن.

من تێگەیشتم کە (سەعید) بەم وتانەی دەیەوێت لەلایەك سنوورێك بۆ نکوڵییکردنی (ڤامپیر نووری) دابنێت و، لەلایەکی دیکەش زەمینەساز بدات بۆ خستنەڕووی بیروباوەڕ و بۆچوونە جیاوازەکانی.

(سەعید) بەردەوام بوو:

– مرۆڤ لە ژیانیدا زۆرێك لە کارەکانی بە ناتەواوی جێ دەهێڵێت و، لە کارکردنی ئەندامەکانی جەستەی خۆی و ڕێکخراویی تەواوی بوونەوەرانی ئەم گەردوونە کاملە ڕانامێنێت و، بەهەند وەریان ناگرێت و، بیر لە هۆکار یا ئامانج یان لێپرسینەوە لەبارەی ئەم هەموو بەخششە ناوازانە ناکاتەوە کە پێیبەخشراون. لەڕاستیدا پێویستە زۆرباش لە خودی خۆی، پاشان بوونەوەرانی ئەم گەردوونە مەزنە ڕابمێنێت و، هەڵوێستەیەك لەسەر ئامانج لە بەدیهێنانیان بکات؛ چونکە تەنها لەم بارەدا دەتوانێت پەی بە ڕاستی بەدیهێنانی خۆی و گەردوون ببات، تا لە حیکمەتی بەدیهێنانی کێوەکان و، دەریا و زەریاکان و، هەوای پاك و ژینگەی پارێزراو و، تەنانەت هەنگوینی هەنگیش تێبگات؟! ئەوەتا ئاژەڵەکان و پێستی ئاژەڵان دەکاتە پۆشاك و، لە گۆشتەکەیان دەخوات و، درەختەکان –کە لەنێو دار و پەردووەوە سەوزدەبن– و، چەندین جۆر میوەی بە تام و بۆن و ڕەنگی جیاوازی بۆ دەگرن، سەرەڕای جوانیی و قەشەنگکردنی دیمەنی سروشت. هەروەك ئاوازی خوێندنی باڵندە دەنگخۆشەکان

ئاسوودەیی پێدەبەخشن و، خۆریش وەك چلچرایەكی مەزن ڕۆشنایی و ژیان بە زەویدا پەخشدەكات و، ئەستێرەكانیش شەوانە وەك گەوهەر ئاسمان دەڕازێننەوە ...

لەڕاستیدا مرۆڤ بەری درەختی ئەمگەردوونە ناوازەیەیە و، تەماشاكارێكی بە دیقەتی ئەم تابلۆ بێوێنە و ڕەنگاڵەیەی سروشتە.. هەموو پێكهێنەرەكانی سروشتیش بەزمانی حاڵ هاواردەكەن: كە بەدیهێنەرێكی بەدەسەڵات و بێ هاوتا لەپشت ئەم نیگارەوەیە، لە گەردیلەیەكی بەچاو نەبیراوەوە تا ئەستێرە و هەسارە و خۆر و مانگ سەلمێنەری ئەم ڕاستییەن. مرۆڤ تەنها بەم جۆرە تێڕامان و لێكدانەوەیە دوور لە ماددەگەرێتی و دنیاپەرستی دەتوانێت قیامەت بباتەوە و، شایستەی ئەو ڕێز و شكۆمەندییە بێت كە خوای گەورە بڕیاری داوە بۆی.

بێ گومان مرۆڤ بەدیهێنەرێكی هەیە، ئەوەتا لەكاتێكدا تەنها خانەیەك لە لاشەیدا لەكاربكەوێت تەواوی لاشەی دەردەدار دەبێت و، لە ئاست نەخۆشییەكی ساناوا بەچۆكدا دێت.

گەر مرۆڤ ئارەزوومەندبێت لە ڕاستیی بوونەوەران تێبگات، پێویستە قەوارەی ئەركی خۆی بە بەراورد بە گەردوون و بوونەوەرانی نێویەوە بزانێت و، دڵنیاشبێت كە گەردوونێك بەم ئاڵۆزییە بێ بەدیهێنەر نایەتەبوون و، بێگومان لەپێناو ئامانجێكدا بەدیهێنراوە.

پێویسته مرۆڤ هەڵوێستەیەك لە بارەی بەدیهێنەری ئەم هەموو گەلەئەستێرە و کاکێشانانە بکات، تا بزانێت ئایا بۆچی بوونەوەرێکی بەناوی مرۆڤ بەدیهێناوە و، تەنێکی ئاگرینی وەك خۆر و تەواوی بوونەوەران و گەردوونی بۆ ڕامهێناوە؟!

بێگومان ژیانێکی لێوانلێو لە خۆشڕابواردن و ئارەزووبازیی، کە کۆتاییەکەی مەرگ و بەخاك سپاردن و، بوونەوە بە خاك بێت، حیکمەتی مرۆڤبوون نییە.

یاسا و ڕێسا گەردوونییەکانیش گەواهیدەری ئەو ڕاستییەن کە بێئامانجیی و خۆشڕابواردنی پووچگەرایانە لەم گەردوونەدا جێیان نییە.

لەڕاستیدا کارێکی ژیرانە نییە ئەگەر وا بیربکەینەوە کە بوونەوەرێکی شکۆمەند و ڕێزداری وەك مرۆڤ پاش مەرگ لاشەکەی دەبێتەوە بەخۆڵ و بە یەکجاریی لەناو دەچێت! گەر وابێت، کەواتە لەبنەڕەتا ئامانج لە ژیانی چی بوو؟ بۆیە بەدڵنیاییەوە پێویستە هۆکار و حیکمەتی مەزن لە بەدیهێنانیدا هەبێت.

بەوپێیەی خوای گەورە عەقڵ و ژیریی بەخشیوە بە مرۆڤ، ئەوا خودی مرۆڤ خۆی موکەللەف و بەرپرسیارە بە دۆزینەوە و دیاریکردنی ئامانج لە بەدیهێنانیدا.

## بابەتێكی پڕبایەخ:

یەكێك لە پیاوەكانی (ڤامپیر نووری) لێـی نزیكبوویـەوە و، ویسـتی شتێك بەگوێیدا بچرپێنێت، بەڵام (ڤامپیر نووری) هاواری كرد:

– لاچۆ لەبەرچاوم كابرا، چۆن گفتوگۆیـەكی ئـاوا ئەپچـرێنی؟ بـڕۆ ڕیزیَ چامان بۆ بێنە.

پاشان ڕووی كردەوە (سەعید) و، وتـی:

– بەردەوام بە كاك دكتۆر، باسێكی زۆر گرنگت هەژاند.

(سەعید)یش بە شێوازە نەرمونیان و شیرینەكەیەوە بەردەوام بوو:

– بڕوانن مرۆڤ چۆن بەدی دەهێنرێت.. سـەرەتا دڵۆپێـك ئـاوە، لـە كاتی دیاریكراوی خۆیدا دەبێتە خوێن، پاشـان گۆشـتپارەیەك، دواتـر ئیسكەكانی دێنەبوون و، بەكامڵ بوونی تەواوی ئەندامـەكانی منـداڵێك دێتــە دنیــاوە و، هێـواش هێـواش ئــەم ئەندامانــەی دەكەونــەكار و گەشەدەكەن.

هــەموو خانەیــەك لــە لەشــی مـرۆڤ بـە ڕێكخسـتنێكی زۆر ئـاڵۆز و، پێوانەی زۆر ورد و دیـاریكراو و، بـۆ سـوود و حیكمـەتێكی دیـاریكراو بـەدی دەهێنرێـت و، هـیچ بـەدیهێنراوێك بـە هەڕەمـەكیی و بێهـوودە بەدی ناهێنرێت.

ڕەنگە بپرسن: كێ بەدیهێنەر و خاوەنی ئەم گەردوونە ناوازەیەیـە؟ ئەو زاتەی ئەم گەردوونە بەڕێوەدەبات و، گەلەئەستێرەكان بەوپـەڕی

ڕێکخراویی دەگێڕێت و، زەوی کردووەتـە لانکـەی زینـدەوەران و، لـە هەمان ساتدا ڕزق و ڕۆزی ملیارەهـا زینـدەوەر دەدات و، لـە تـۆوێکی هێندەی سەرەدەرزییەك درەختێکی گەورە سەوزدەکات و، لـە دڵۆپـە ئاوێك مرۆڤێکی وەها دارا بەدی دەهێنێت کێیە؟

هەندێك بەدیهێنانی هەموو گەردوونی ئاڵۆز دەدەنە پاڵ (سروشـت) و، ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەیان پشتگوێ خستووە، کە: (سروشـت ناوێکـە بـۆ دەسـتەی گیانـدار و بـێ گیـانی ئـەم گەردوونـە)! مەگـەر کەسانی خاوەنی ئەم بیرۆکەیە لە یادی خۆیانی دەبەنەوە، کە ئەگـەر چـەکوش و بزمـار و تەختـە لـە ژوورێکـدا دابنـێن و، ملیۆنێـك سـاڵ چاوەڕێ بکەن بۆ ئەوەی ببێتە زیندەوەرێك، ئەوا ئەم کارەیان زۆر لە عەقڵ و ژیریی و هۆشمەنـدیی خوداپێبەخشـراویانەوە دوورە، چـونکە هەتا وەستایەکی ژیر و هۆشمەند لەمانـە بەرهـەمێك دروسـت نـەکات، مەحاڵە هیچ ئەنجامێکی ژیرانەی لێ چاوەڕێ بکرێت.

کەوابوو ئایا ئەو ڕاستییە وەك ڕۆژی ڕوونـاك ئاشـکرا نییـە: کـە لـە شتانی بێ گیان و عەقڵ و ویست و دەسەڵات هەرگیز گیاندارێك لـەناو سروشتێکی بێ دەسەڵاتدا نایەتە بوون؟!

لەنێو گیاندارانیشـدا مـرۆڤ لەهـەموویان ژیرتـر و بـەتواناترە، بـەڵام لەئاست دروستکردنی تەنها گەڵایەکدا دەستەوسانە، بـەڵکو بـەردەوام مەراقی دۆزینـەوە و گەیشـتن بـە بەدیهێنـەری هەیـە. سروشـتیش بـە

گیانـدار و بێگیانـەوە دارای بـەدیهێنانی تـەنها خانەیەکیشـی نییـە، کەواتە هەر بە تێڕامان لە بوونەوەران ئاسـەواری توانـا و دەسـەڵات و خاوەنداریێتیی پەروەردگاری بەدیهێنەری تاکو تەنیا دەبینین.

لەڕاستیدا جێی خۆیەتی لە کەسانی خاوەنی بیردۆزی (سروشتی بەدیهێنـەر)، -کـە هەمیشـە زاراوەی وەك: (یاسـاکانی سروشـت) بـەکاردەهێنن- بپرسین: "ئایا ئـەم یاسـایانەی سروشـت، خـاوەنی ژیریین؟ ویست و توانا و دەسەڵاتی بڕیاردان و بەدیهێنانیان هەیە؟!"

بێگومان وەڵامەکە "نەخێر" دەبێت، چونکە ئەگـەر "بـەڵێ" بێـت، ئـەوا بەتـەواوی نکـوڵی لـە بـوونی مێشـك و عـەقڵ دەکـەن. کەواتـە ئاشـکرایە کـە (ئـەوان وتـەنی: یاسـاکانی سروشـت)، خۆیـان بەڵگـەن لەسەر بوونی پەروەردگار. ڕەنگە بپرسن: "بۆچـی؟" چـونکە ئەگـەر یاسایەك لەئارادا بێت، ئەوا بێگومان هێزێك هەیە کە دایڕشتبێت.

هـیچ یاسـایەك لەنەبوونـەوە و بێخـاوەن نایەتـەبوون، ئەمـەش زۆر بـەڕوونی لـەو یاسـایانەدا دەبیـنین کـە مـرۆڤ خـۆی دایاندەڕێـژێت، هـەروەها بـۆ جێبـەجێکردنی هـەر یاسـایەك پێویسـتە دادوەرێـك یـا دەسەڵاتدارێك هەبێت، خۆ ئەگەر لە ژیـانی مرۆڤـەوە بـڕوانین، ئەگـەر دادوەر لـەئارادا نـەبێت، ئـەوا هـیچ یاسـایەك بـێ بکـەر و جێبـەجێکار لەتوانایدا نییە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە لەگەڵ تاوانباردا بکات.

دوور لەو کەسانەی نایانەوێت ڕاستییەکان ببینن و، و دەست لە یاخیبوون و سەرکەشیی هەڵگرن و، دان بە بوونی پەروەردگاردا بنێن، هەر کەسێك بە دیقەتەوە لە گەردوون بڕوانێت، دڵنیادەبێت کە سروشتیش نیگاری ڕەنگدانەوەی ئاسەواری توانا و دەسەڵات و کارامەیی بەدیهێنەرەکەیەتی و، لە هەر سوچ و لایەکی ئەم نیگارە بڕوانین زمانحاڵی ئەم ڕاستییەن.

## باسەکە بۆ وێنەیە:

(ڤامپیر نووری) زۆر بەپەرۆشیی و بە سەرنجەوە گوێی بۆ وتە شیرین و بەڵگەئامێزەکانی (سەعید) ڕادێرابوو و، وەك ئەوەی یەکەم جاری بێت کە ڕاستییەکی گەوهەرئاسای بەنرخی وەهای دۆزیبێتەوە و، لە ڕووخساریدا زۆر بەڕوونی ئاسەواری ئەم کاریگەربوونە دەبینرا. زوو زووش چای تازە دەهێنرا و، هەمووان بۆ تێگەیشتن لە باسەکە بێدەنگبووبوون.

(سەعید) لەسەر باسیی تاك و تەنهایی و بوونی پەروەردگار بەردەوام بوو:

– ئاشکرایە گەردوون بە سیستمێکی زۆر ئاڵۆز و ڕێکخراو بەڕێوەدەچێت، ئەمەش واتە لە وردبینترین گەردیلەوە تا مەزنترین ئەستێرە و گەلەئەستێرە ئەرکی خۆیان لەم سیستمەدا دەزانن، بەڵام ئەوانەی کە بوونی بەدیهێنەر ڕەت دەکەنەوە و –پاك و بێگەردی بۆ

خوای گەورە- دەڵێن: "خوا نییە"، نکوڵیی لەم ڕاستییە دەکەن و، بەمەش خۆیان لەڕیزی نەفام و نەزاناندا هەژمار دەکەن، تەنانەت ئەگەر دان بەم کارڕاپەراندنەی پێکهێنەرەکانی گەردوونیشدا بنێن، ئەوا دیسان پێویستە ئەوەش پشتگوێ نەخەن کە لە وردبینترین گەردیلەوە تا مەزنترین کۆمەڵەی خۆر فەرمانبەرداری بەدیهێنەرێکی زۆر مەزنن، کە هەموویانی لە سایەی سیستەمێکی ڕێکخراودا بەدیهێناوە.

با ئەمە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

لەدەمی نیوەڕۆدا، کاتێك تیشکی خۆر بەستوونی دەیدات لە ڕووی ئاوێك، پاشان تیشکێکی ڕووناکی و جۆرە بریسکانەوەیەك لەڕووی ئاوەکەوە دەشکێتەوە و بەسەر تەنەکانی دەوریدا پەخش دەبێت، ئایا دەتوانین بڵێین ئەمانە هەر لەخۆوە دەرکەوتوون، یاخود دەڵێین ئەمانە تەنها ئاسەواری چەند تیشکێکی ڕووناکیی خۆرن، واتە سەرچاوەی ڕاستەقینەیان خۆرە.

ئەوەی لەم گەردوونە ناوازەیەشدا بەرچاودەکەوێت، لە سیفەتگەلی وەك زانست و، حیکمەت و، توانا و دەسەڵات و، ئیرادە لە هەموو گەردیلەیەکی پێکهێنەری ئەم گەردوونەدا ڕەنگیان داوەتەوە و و، بە عەقڵ و بیروهۆش دەسەلمێنرێت کە مەحاڵە لەناکاو و بێ بەدیهێنەر

هاتبێتنە بوون، بەڵکو سەراپای ئەمانە دەرەنجامی ڕەنگدانەوەی توانا و دەسەلاتی پەروەردگاری زانا و دانا هاتوونەتەبوون.

(ڤامپیر نووری) لە دەریای بیرکردنەوەدا نوقوم بووبوو، دیاربوو لێکدانەوەی بۆ ئەو ڕاستییانە دەکرد کە دەخرانەڕوو و، بەڕووخسارییەوە ئاسەواری گۆڕانکاریی و بێداربوونەوەی مەزن هەست پێ دەکران.

لەنێوەندی ئەم قسەوباسانەدا پاسەوانی زیندانەکە هاتەژوورەوە و، وتی:

– بەڕێوەبەر کاری بە (سەعید) و (زوبێر)ە.

(ڤامپیر نووری) وەك ئەوەی لە خەو ڕاچڵکێت، لەناکاو وتی:

– بێ دەنگ بە کابرا، تۆش کاتت نەدۆزیەوە ئێستە نەبێ؟ وەك ئەبینی خەریکین گفتوگۆ ئەکەین. برۆ بە بەڕێوەبەرەکەت بلێ ئەو دووگەنجە سەرقاڵن و، هەر کە کارەکەیان تەواو بوو، خۆم ئەیانئێرم بۆلای.

ئەو پاسەوانە بەستەزمانەش لە ترسی (ڤامپیر نووری) بێ ئەوەی وشەیەکیش بڵێت، دەرگاکەی داخست و چووە دەرەوە.

## بۆچی خوا ئێمەی بەدیهێناوە؟

(ڤامپیر نووری) دووبارە ڕووی کردەوە (سەعید) و، وتی:

– باشە، با وای دابنێین خوا هەیە، کەواتە بۆچی منی بەدیهێناوە؟ ئامانج لە بوونی من چییە؟

(سەعید)یش وتی:

– بەڕێزم، ئەم بابەتە هەم زۆر گرنگە و، هەم باس و ڕوونکردنەوەی زۆری پێویستە، ئێمەش بۆئەوەی بە باشترین شێوە ڕوونیبکەینەوە، سوود لە کتێبێك وەرئەگرین، کە زۆر بە ڕوونیی ئاماژەی بەم باسە کردووە.

لە جانتاکەیدا کتێبێکی سووری دەرهێنا، لاپەڕەکانی هەڵدایەوە و، دەستیکرد بە خوێندنەوە، بە شێوەیەکیش کە لە ئاست تێگەیشتنی ئێمەدا بێت شیدەکردەوە و، ڕوونکردنەوەی لەبارەوە دەدا. ئێمەش زۆر بە پەرۆشیی گوێمان بۆ باسەکە ڕادێرا بوو.

"لە سەردەمێکدا پادشایەك چەندین سامانی زۆر و، گەنجینەی گەورە گەورەی هەبوو کە پڕبوون لە جۆرەهای جۆری گەوهەر و، ئەڵماس و، زمڕووت، لەگەڵ چەندین گەنجینەی شاراوەی سەرسوڕهێنەرتری زۆر و زەبەندەدا. ئەم پادشایە تا بشڵێیت زانا و ئاگاداری تەواوی زانستە ناوازە و لەژمارە بەدەرەکان بوو، هەروەك

خـــاوەنی چـــەندین کارامـــەیی بـــێ وێنـــە و، داهێنکـــاری بـــوو لـــە سنعەتەکانیدا.

جـا هـەروەك هـەموو (جـوان) و (خـاوەن کـەماڵ)ێك حـەزدەکات تەماشـای جـوانی و کـەماڵی خـۆی بکـات و پیشـانی غـەیری خۆیشـی بدات، ئەم پادشا مەزنەش بەهەمان جۆر بـوو، ویسـتی پێشـانگایەکی مەزن سازبکات بۆ پیشاندانی بەدیهێنراوە پـڕ لـە وردەکـاری یـەکانی، تـاوەکو سـەرنجی میللەتەکـەی بـۆ مـەزنیی دەسـتەڵاتداری و سـامانە زۆرەکەی خـۆی ڕابکێشـێت و، بـەم کـارەش هەنـدێ لـە دروسـتکراوە وردو نائاسایی یەکانی و، لایەنە سـەیرو سەرسـوڕهێنەرەکانی ناسـیی خـۆی بـۆ ئـەوان دەربخـات هـەموو ئەمانـەش بـۆ ئـەوەی لـە "دوو" ڕووەوە جوانی و کەماڵی مەعنەویی خۆی ببینێت.

یەکەم : بەچاوی وەردبین و تیژی خـۆی ئـەو شـتانە ببینێـت کەلـە پێشانگاکەی دا خشتوونیەتە بەرچاو.

دووهەم: بە چاوی غەیری خۆیشی بیانبینێت.

لەپێناوی ئەم دانایی یەدا، پادشا کۆشکێکی تـابلێی بـەرزو مـەزنی بنیـات نـا، پاشـان بـە لێزانانـە ئـەو کۆشـکەی بەچـەند مـەنزڵ و فەرمانگەیەك دابەش کردو، هەریەك لەو بەشانەشی بـە گەوهـەرەکانی نـاو گەنجینـە جـۆراو جۆرەکـانی خـۆی ئارایشـت داو، بـەجوانترین نیشانەو ئاسەواری داهێنانـەکانی خـۆی نەخشـاندنی و، بـە وردترینـی

جۆرەكانی هونەری زانایی و دانایی ڕێكی خستن و، بەجیٚ دەستی پڕ لە ئیعجاز و نائاسایی كارەكانی خۆیشی ڕازاندینەوە.

كە كۆشكەكەی تەواوكرد، چەندین سفرەو خوانی باش و جوانی تێدا ڕاخست كە هەموو چەشنە خواردەمەنیەكی بەتام و باشترین نیعمەت بە نرخەكانی لەسەردانا بوون و، بۆ هەموو تاقمێك ئەو جۆرە سفرەو خوانەی بەتایبەتی ڕازاندەوە كە شیاوی بێت، بەم جۆرە میوانداری یەكی گشتی و باشی سازدا و، بەم كارەش سەخاوەتمەنی و داهێنان و دەست ڕەنگینی یەكی وای نواند كەپێشتر نەبینرابوو، بەڕادەیەك كەهەریەك لەو سفرەو خوانانەی لە سەدان جۆری وردەكاریی نەرمونیان و شوێنەواری سنعەتی ورد پڕكرابوون، بەهۆی ئەو نیعمەتە بەنرخ و لەژمارە بەدەرانەی كەبەسەریان دانرابوون.

پاشان هەموو میللەت و دانیشتوانی ولاتەكەی بۆ میوانداری و گەشت و سەیران و تەماشاكردنی پێشانگاكەی بانگ كرد و، گەورەی كار پێسپێرراوان و نێرراوانی بەڕێزی كۆشكەكەی خۆیشی لەهەموو دانایی یە بیٚ وێنەو لایەنە داهێنانكاری یەكان و واتا وردەكانی هەموو بەش و لایەكی كۆشكەكەی تیٚ گەیاند، بۆ ئەم كارەش مامۆستایەكی پێشەواو ڕابەر و كارامەی بۆ میللەتەكەی دانا، تاكو مەزنی ئەو كەسەی كۆشكەكەی بنیات ناوە و، نەخش و نیگاری بیٚ وێنە و، هاوسەنگی تێدا داناوە، بەخەڵكی بناسێنێت و، ئەوانەی دێنە ناویەوە

شارەزای هێماو گەوهەرە هۆنراوە و، ئاماژە وردەکانیان بکات و، مەودای ئەوەیان بۆ دەرخابخات کەتا چەندە ئەمانە دەبن بە بەڵگەی مەزنی و تەواوی و کارامەیی و وردەکاریی خاوەنی ئەو کۆشکە و، ڕێ و شوێنیێ چوونە ناو کۆشك و ڕەویە و چۆنێتی هەڵسوکەوت و، هاتوچۆ تیایدا، بەو جۆرەی کەمایەی ڕەزامەندی پادشا بێت. – کەلەپشتی پەردەوە نەبێ، نابینرێت– بۆخەڵکی ڕوونبکاتەوە.

ئەم مامۆستا شارەزایە لە ناوەڕاستی قوتابیەکانی و، لە فراوانترین فەرمانگەی کۆشکەکەدا بوو، یارمەتی دەرانیشی کە فەرمانگەکانی تری کۆشکدا بڵاو بووبوونەوە.

ئەم مامۆستایە دەستی بە ڕێنمایی یەکانی کرد و وتی:

"خەڵکینە ! مەبەستی سەرداری ئێمە، کەخاوەنی ئەم کۆشکە بێ وێنە و فراوانەیە، لەبنیاتنانی ئەم کۆشکەو پیشاندانی ئەم ڕواڵەتانەی وان لەبەرچاوتاندا، ئەوەیەکە "خۆی بە ئێوەی بناسێنێت" کەواتە ئێوەش بیناسن و هەردەم بۆ باشتر ناسینی تێ بکۆشن.

بەم ئارایشتکاری یە جوانانەش دەیەوێت " خۆی لای ئێوە خۆشەویست بکات"، ئێوەش بەوەی کار و، سنعەتەکانی ئەوتان بەلاوە جوان بێت و، ڕێزی شایانی لێ بگرن، خۆتانی لەلا خۆشەویست بکەن...

هەروەها بەو چاکەکاری و نیعمەتانەی کە پێتان دەبەخشێت، دەیەوێت خۆی لای ئێوە خۆشەویست بکات و، خۆشەویستی خۆیتان پیشان بدات. دەسا ئێوەش بەوەی کە بەباشی گوێ بیستی بن و، فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بن، ئەوتان خۆش بوێت.

بەم ڕێز لێنان و نیعمەت پێ بەخشینەش دەیەوێت (شەفەقەت و میهرەبانی خۆیتان بۆ دەربخات). ئێوەش بەرامبەر بەمە، شوکرانە و ڕێز لێنانی خۆتانی بۆ دەربڕن...

دەیەوێت بە ئاسەوار و شوێنەوارەکانی کەماڵی خۆی، کە لەم بەدیهێنراوە جوان و تەواوانەدا بەئاشکرا دیارن، (جوانییە مەعنەوییەکەی خۆیتان بۆ دەربخات). ئێوەش شەوق و، تاسە و، ئارەزوومەندیتان بۆ بینین و بەیەك گەیشتن و دەستخستنی ڕەزامەندیی ئەو، ئاشکرا بکەن.

ئەوەی لە ئێوە دەوێت کە بزانن:" هەر تەنها ئەو تاکە دەستەڵاتدار و، فەرمانڕەوای سەربەخۆیە"، بەوەی کە بەچاوی خۆتان دروشم و مۆری ئەو دەبینن کە بەسەر هەموو بەدیهێنراوانەوەن و، بەکەس لاسایی ناکرێتەوە، چونکە هەموو شتێك هی ئەوەو تایبەتە بەو پادشایە و، لەدەستی توانستی ئەو دەرچووە کەواتە دەبێ باش بزانن کە جگەلەو کەسی تر دەستەڵاتدار و، فەرمانڕەوا نییە، چونکە هەر ئەو پادشای دەستەڵاتداری تاك و تەنیای بێ وێنە و بێ هاوتایە).

ئەم مامۆستا مەزنە بەم چەشنە گوفتـارە شـیرینانەی کـە شـایەنی پلەو شان و شکۆ و مـەزنی و، چـاکەکاریی پادشـان، لەگـەڵ ئەوانـەدا دەدوا دەهاتنە ناو کۆشکەکە و، سەیریان دەکرد.

پاشان ئەوانەی کە هاتنە ناو کۆشکەکە بوون بە دوو دەستەوە:

دەستەی یەکەم: ئـەم دەسـتەیە ئەوانـە بـوون کـە خـاوەنی ژیریـی ڕوون و، دڵ و، دەروونـــی دڵنیـــا و ســـاف و بێگـــەرد بـــوون و، ڕێـــزی خۆیانیان دەزانی، ئەمانە تێگەیشتبوون لەوەی ئەم هەموو کارو لوتفە لـــە پشـــتیەوە، قـــودرەت و حیکمـــەتێکی سەرســـوڕهێنەری تێدایـــە، لەمامۆستاکەیانەوە بە تەواوی وانەکەیان وەرگرتبووە وە بـۆ کۆشـکە بەرزتر و ئەبەدی یەکانیان ڕەدوانی"[١].

## سەرکردەی پاسەوانەکان:

(سەعید) باسـەکەی تـەواو کـرد و، دەرگـای زیندانەکـە سـەرلەنوێ کرایەوە و، پاسەوانێکی دیکە هاتەژوورەوە.

– (زوبێر) و (سەعید) لێرەن؟

(ڤامپیر نووری) ناوچەوانی گرژکردەوە و هەستایەوە و، وتی:

– ئێوە چیتان لەو (سەعید) و (زوبێر)ە ئەوێ؟

---

١– وتەکان: (وتەی یازدەیەم).

سەرکردەی پاسەوانەکان لەم هەڵوێستەی (ڤامپیر نووری) زۆر سەری سوڕما بوو و، وتی:

– جەنابی بەڕێوەبەر کاری پێیانە..

– بە بەڕێوەبەرەکەشتان بڵێن، ئێمە سەرقاڵی گفتوگۆیەکی گرنگین، ڕێ بدەن تەواوی کەین، خۆ پێمان وتن کە گفتوگۆ تەواو بوو دەیان نێرینە لاتان، بەڕێوەبەرەکەت گەر کاری زۆر گرنگی پێیانە، با خۆی بێتەئێرە و، هیچ نەبێت کەمێك لەم باسانە سوودمەند بێ، سا بەڵکو کەمێك عەقڵی بخاتەگەڕ.

(ڤامپیر نووری) چەن خولەکێك لەبەرخۆیەوە بۆڵەبۆڵی کرد و، هەموو زیندانەکانی نێو ژوورەکە لە تووڕەبوونەکەی زۆر دەترسان.

## ئایا ئەرکی مرۆڤ چیە؟

– باشە ئێمەی مرۆڤ ئەرکمان چییە لەم دنیایەدا؟

(ڤامپیر نووری) ئەم پرسیارەی بە گاڵتەجاڕییەوە نەکرد، بەڵکو دیاربوو پاش بیرکردنەوە و لێکدانەوەیەکی زۆر لەناخییەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئاشکرا بوو لەناخیدا ڕاست و هەڵە و، جوانی و ناحەزیی و، هەموو دژەکان بەیەکدا شێوابوون و، زریانێکیان لە دەروونیدا سازاندبوو. لەڕاستیدا ئێمەش تا ڕادەیەك لەو بارە دەروونییەدا دەژیاین.

ئەم جارەیان (زوبێر) کتێبەکەی بەدەستەوە گرت و، وتی:

– لەم کتێبەدا، وەڵامێکی زۆر گونجاو بۆ پرسیارەکەتان هەیە.

پاشان دەستی کرد بە خوێندنەوە و، بەنموونەیەك دەستی پێکرد:

"لەجەنگی جیهانی (سەفەربەلك)دا دوو سەرباز پێکەوە لە تیپێکدا بوون، یەکێکیان کارگوزار و مەشق پێکراو بوو، ئەرك و فەرمانی خۆیشی تا بڵێیت بەدڵ بوو.

ئەوی تریشیان: هیچ نەزان و تەمبەڵ و، سك و نەفس پەروەرد بوو.

یەکەمیان: کە ئەرکی خۆی بە ڕێکوپێکی ڕادەپەڕاند، هەمیشە بایەخی بە مەشق و داخوازی یەکانی جیهاد دەدا و، هەرگیز بیری لە پێداویستییەکانی خواردن و خواردنەوە نەدەکردەوە، چونکە دڵنیابوو لەوەی کە: ژیاندن و، چارەسەرکردنی لەکاتی نەخۆشیدا و، دابینکردنی کەرەسەو ئامێر و پێداویستی یەکانی، تەنانەت پاروو کردنیش بە دەمیەوە لەکاتی پێویستدا، ئەمانە هەموویان کار و ئەرکی سەرشانی دەوڵەتن، بەڵام ئەرکی سەرشانی ئەم تەنها مەشق و جیهادە، خۆ ئەمەش ڕێ لەوە ناگرێت کە هەندێ جار و لە کاتی پێویستدا ئامادەکردنی خواردن و هەندێ کاروباری،وەك شۆردنی قاپ و کەوچکەکانی خواردن بخاتە ئەستۆی خۆیەوە.

جا ئەگەر پرسیار لەم سەربازە بکرایە و پێی بوترایە:

– ئایا تۆ خەریکی چیت و بە چ کارێکەوە سەرقاڵیت؟

(برادەر! ئەو ئەرك و فەرمانبەریە سەرەكییەی كە تۆ لێرەدا بۆی هێنراویت تەنها مەشق و جیهادكردنە، بۆ دابینكردنی پێداویستیەكانی تریش، تەنها پشت بەو پادشایە ببەستە كە تۆلە سوپاكەیدایت، دڵنیابە كە نایەڵێت بەبرسی بمێنێتەوە، چونكە بەخێوكردنی تۆ و ئامادەكردنی پێداویستیەكانت ئەرك و فەرمانبەری ئەوە، پاشان بشزانە كە تۆ تاقە كەسێكی تەنها و هەژاریت و، لەهەموو جێگەیەكدا خۆتت پێ بەخێوناكرێت، ئەوەشت لەیادنەچێت، كە ئێمە لە جیهاد و جەنگێكی گەورەداین، ئەگەر لەسەر یاخی بوون بەردەوام بیت ئەوا زۆر نزیكە پادشا لە تۆڵەی ئەم یاخیبوونەتدا سزایەكی سەخت و گەورەت بدات)[1].

باسەكە هێندە سەرنجڕاكێش و بەچێژ بووبوو، كە هیچ كەس لە ژوورەكەدا دەنگی لێوە نەدەهات و، هەریەك لە ئێمە وەك مرۆڤێك بوو كە لە تینوویەتی بیاباندا زۆری چەشتبێت و، لەناكاو گەیشتبێتە مێرگێكی دڵڕفێن و، بە ئاوێكی سازگار ڕۆحی تینوومان تێرئاوكردبێت.

---

١- وتەكان: (وتەی پێنجەم).

## یەکەم نوێژ لە ژووری زینداندا:

گەنجەکان مۆڵەتیان خواست، تا نوێژەکەیان بکەن.

لەناکاو (ڤامپیر نووری)ش بە پرتاو هەستایەوە و، وتی:

- ئادەی کوڕە، خێرا ئەو گۆشەیەیان بۆ حازر کەن، با نوێژەکەیان بکەن، تا ئەوانیش تەواو ئەبن، خێرا ئێوەش خوانێکمان بۆ ئامادەکەن.

لەلایەك گەنجەکان بەخشوعەوە نوێژیان دەخوێند، لەلایەکی دیکەوە خواردن ئامادەدەکرا و، مێزیان بە چەند جۆرێك خۆراك ڕازاندەوە و، هەموو زیندانەکانی ژوورەکە دەعوەتی (ڤامپیر نووری) بوون. لەڕاستیدا ئەم جۆرە ڕەفتاری ڕێزلێنانە وەك جیاکارییەکی زۆر تایبەتی (ڤامپیر نووری) بۆ ئێمە هەژمار دەکرا، واتە (ڤامپیر نووری) لەسەر شەرەفی ئەو دوو گەنجە ئەو خوانەی سازدا و، لەهەمان کاتدا ئەم ڕەفتارە خۆی لەخۆیدا دانپێدانانێك بوو بە کاریگەربوونی بە باسەکە.

لەکاتێکدا گەنجەکان نوێژیان دەکرد، (ڤامپیر نووری) زۆر بەسەرنجەوە لەژێر چاوەوە لێی دەڕوانین و، بە ڕووخساریدا دیاربوو کە چەندەها پرسیار بە مێشکیدا گوزەر دەکەن و، مەراقی وەڵامەکانیان دەکات. لەڕاستیدا پرسیارەکانی (ڤامپیر نووری) زمانحاڵی دەروونی شێواوی ئێمەش بوو.

کە گەنجەکان لە نوێژەکەیان تەواوبوون، (ڤامپیر نووری) وەك ڕێزلێنان هەستایەوە. بەستەزمانە! لەوانەشە ئەمە بۆ یەکەمجاری بێت بەم شێوەیە نەزاکەت بنوێنێت.

گەنجەکانیش بە ڕێزێکی زۆرەوە دەستبەجێ وتیان:

– ئەستەغفیروڵڵا گەورەم، شتی وا نابێت، لەئاست هەستانەوەی کەسێکی بەڕێزی وەك جەنابتاندا خەجاڵەتین. زۆر سوپاس.

هەر بەمجۆرە ڕەفتار و گوفتارانەیان (ڤامپیر نووری)یان کەمەندکێش کرد.

## ژیان بازرگانییەکە:

لە دەوری مێزەکە دانیشتین و، لەگەڵ دەستپێکی نانخواردنەکەدا (ڤامپیر نووری) سەرلەنوێ پرسیارەکانی درێژە پێدا و، وتی:

– باشە ئەم ژیانە بازرگانییەك نییە؟ هەر کەسێك لەم ژیانەدا ڕێگەی مانەوە بدۆزێتەوە و، کیسەکەی پڕبکات، باشترین بازرگانی کردووە، خۆ هەموو مرۆڤەکان بۆ ئەمە ئەکۆشن، ئێمەش بۆ ئەوە هەوڵ ئەیەین، تیجارەتیش باش و خراپی تیا نییە و، کارکردن بە هەموو جۆرەکانییەوە شەرەفمەندانەیە. مەگەر وا نییە؟

وا دیار بوو (ڤامپیر نووری) خوازیار بوو بەم پرسیارانە پاساو بۆ کارە خراپەکانی بێنێتەوە، واتە دەیویست بڵێت: "من وەك کەسێکی بەدکار و پیاوکوژ ناسراوم، کە ستەم لەخەڵك دەکات، بەڵام کارەکە

بەم جۆرە نییە، بەڵکو من تەنها هەوڵمداوە لە داوی ئەم دنیا جەنجاڵەدا پێگەی خۆم بپارێزم و، دوو پول پەیدا بکەم، مەگەر پەیداکردنی بژێوی کارێکی شەرەفمەندانە نییە؟". تەنانەت بەم وتەیەیدا دیاربوو چاوەڕێی دەستخۆشی دوو گەنجەکەشە و، دەیویست قایلیان بکات کە کارەکانی بەپێوەری ئەم دنیایە ڕاستن.

(زوبێر) بە هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیکی کتێبەکەی دەستی، بەردەوام بوو و، وتی:

– نووسەری ئەم کتێبە نموونەیەك لەم بارەیەوە دەدات، گەر ئارەزوو دەکەن، با لەپێشدا بیخوێنینەوە، دواتریش شیکردنەوەی بۆ دەکەین.

"پادشایەك دوو کێڵگەی گەورەی بە دوو کەس لە دانیشتووانی وڵاتەکەی خۆی بە ئەمانەت سپارد، هەموو شتێکیش لەم دوو کێڵگەیەدا هەبوو، لە کارگە و ئامێر و چەك و ئاژەڵ و گەلێ شتی تر، لەو کاتەشدا جەنگێکی گەورە و گەرم لە ئارادا بوو کە هەموو شتێکی وێران دەکرد و لەناوی دەبرد و، تێکدان و ون کردن و وێرانی و گۆڕانکاریی بەسەر هەموو شتێکدا دەهێنا، لەبەر ئەمە و لەم کاتەدا، پادشاکە–یەکێکی لە پیاوە نزیك و باوەڕپێکراوەکانی خۆی هاوڕێ لەگەڵ ئەم فەرمانە پڕ سۆز و بەزەییەدا بۆ لای ئەم دوو کەسە نارد:

*(ئـەم ئەمانەتـەم پـێ بفرۆشـنەوە کـە لای ئێـوە دامنـاوە، تـاکو بیپارێزم بۆ خۆتان و لەم کاتە ناهەموارەدا لە دەستتان دەرنەچێت و بێهوودە نەڕوات. هەر کە جەنگیش تەواو بوو، دەتاندەمەوە...

*وەك ئەوەی ئەمانەتەکە موڵکی خۆتان بێت، نرخێکی باشـتان لـە بەرامبەرەوە بۆ دادەنێم و پاداشتێکی چاکتان دەدەمەوە...

*سـەرجەمی ئـەو ئـامێر و مەکینانـەی کـە لاتـان دامنـاون، لـە کارگەکانمدا و بەناوی خۆمەوە دەیانخەمە کار، بەمەش نرخیـان یـەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە، سەرەڕای ئەمە، هـەموو قازانجێکیشـی هـەر بۆ خۆتانە.

*خۆم بەرپرسی گشت پێویستی و خەرجییەکی ئەو ئامێرانە دەبم، چـونکە ئێـوە لەبـەر (هـەژاری) و (بـێ دەسـتەڵاتی) توانـای ئـەو خەرجیەتان نییە.

*هـــەموو بەرهـــەم و دەســـتکەوتێکی کارگەکـــەش بـــۆ خۆتـــان دەگێڕمەوە، ئەوەش بـزانن کـە جـارێ لای خۆتـان دەیهێڵمـەوە هـەتا کاتی وەرگرتنەوەی دێت، بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن.

ئەمە پێنج دەستکەوت لەتەنها یەك مامەڵەدا:

– گومان لەوەدا نییە کە هەرچیتان لایـە دەفـەوتێت و لەدەسـتتان دەچێت، چـونکە وەك لەبەرچـاوتاندایە هـیچ کەسێك ناتوانێـت شـتی خۆی بپارێزێت.

– لەو نرخ و پاداشتە بەرزانە بێبەش دەبن..

– ئەو مەکینە و ئامێر و کانزا و تەرازووە بەنرخانەش لە ئەنجامی کارپێنەکردن و فەرامۆشکردنیان، نرخیان نامێنێت و بێ کەڵك دەمێنێتەوە..

– هەر تەنها خۆتان بەرپرسی بەڕێوەبردن و پاراستنیان دەبن.

– سەرەنجامیش سزای دەستپیسان لەم ئەمانەتە دەچێژن! ئەمەش پێنج زیان لەتەنیا یەك مامەڵەدا.

سەرەڕای ئەمانەش، ئەو کەسەی بەمنی بفرۆشێتەوە دەبێت بە سەربازێکی سەربەست و نەبەرد و تایبەتی خۆم و، بەناوی منەوە ڕەفتار و هەڵسوکەوت دەکات، نەك وەکو دیلێکی دەست بەسەرو ئاسایی و بێ خاوەن)!

لێرەدا دوو پیاوەکە بە وردی گوێیان لەم وتە شیرین و فەرمانە پادشاییە ڕاگرت:

زیرەك و هۆشمەندەکەیان وتی:

بەسەر چاو! بە خۆشحاڵی و شانازی و سوپاسیشەوە بەم فرۆشتنە ڕازیم، بەڵام ئەوی تریان، کە خۆپەرست و لەخۆبایی و بەفیز و دەمار بوو، وا گومانی دەبرد کە ئەو کێڵگەیە هەرگیز نافەوتێت و، لە ئاڵوگۆڕی زەمانە و تەپاوتلی ڕۆژگار و شڵەژانی ڕووداوەکانی دنیا بێئاگابوو، ئەم یەکەیان وتی:

نـەخێر... پادشـا کێیـە؟ مـن مـوڵکی خـۆم نافرۆشـم و، ژیـان و ڕابواردنیش لەخۆم تێکنادەم!

بەڵێ، چـەرخی گـەردوون هەڵسـوڕا و ڕۆژگـاریش گـۆڕانی بەسـەردا هات، تا ئەو ڕادەیەی کـە یەکـەمیان گەیشـتە پلـەو پایەیـەك خـەڵکی خۆزگەیان پێ دەخواست و، لە ناوەندی نازو نیعمەت و چاکەکاری و کۆشکی پادشادا بە کامەرانی و بەختەوەری دەژیا و گوزەرانی بەسەر دەبرد...

کەچـی ئـەوی تریـان دووچـاری بـارێکی هێنـدە دژوار و گرفتـاری حـاڵێکی ئەوەنـدە ناهـەموار بـوو کـە هـەموو کەسـێك بـەزەیی پێـدا دەهاتەوە، هەرچەندەش شایانی ئـەو ئاکامـە بـوو، چـونکە ئـەنجامی هەڵە و تاوانی خۆی بوو هاتبووە ڕێی. ئیتر نە شادمانیی بۆ مانـەوە و نە موڵك. سەرباری هەموو ئەمانە، سزای خۆیشی وەرگرت!

ئەی دەروونی لەخۆباییم!

لە دوور بینی ئـەم چـیرۆکەوە سـەیری ڕووی خـاوێن و درەخشـانی (ڕاستی) بکە:

مەبەست لە پادشا: پادشـای ئـەزەل و ئەبـەدە، کـە پـەروەردگار و بەدیهێنەری خۆتە..

کێڵگەو ئامێرەکانیش ئەو شتانەن کە لە ژیانی دنیادا هەن، وەك: لەش و، گیان و، دڵ و پێکهێنەرەکانیان لە : چاو و، گوێ و، مێشك و، ئەندێشە، واتە هەموو هەستە دیار و نادیارەکان.

نێرراوە بەڕێزەکەش: پێغەمبەری خۆشەویستمان حەزرەتی محەمەدە ﷺ فەرمانە پادشاییە پیرۆزەکەش: قورئانی پیرۆزە، کە ئەو بازرگانییە گەورەیەی باسمان کرد لە م ئایەتەدا ڕادەگەیەنێت:﴿ إِنَّ اللّٰهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾...

ئەو مەیدانە پڕ لە شڵەژان و جەنگە ڕووخێنەرەش: بارودۆخی دنیایە کە سەقامگیر بوونی نییە، هەردەم لە ئاڵوگۆڕ و تەپاو تلدایە، هەر ئەمەشە کەبە جەخت کردنەوە ئەم پرسیارە ئاراستەی بیری مرۆڤ دەکات و هانی دەدات کە بڵێت:

(ئێمەی ئادەمیزاد هەرچییەکمان هەیە وەك خۆی نامێنێت و لەسەر یەك بار جێگیر نابێت و لە ئەنجامیشدا لە دەستمان دەردەچێت، ئایا دەبێ هیچ چارەسەرێك نەبێت بۆ ئەم بارە پەرێشانە. ئایا ناگونجێت ئەم لەناو چوون و فەنایە بکرێت بەمانەوە و نەمری).

لەم کاتەدا کە مرۆڤ نوقمی ئەم جۆرە بیر و ئەندێشانەیە، گوێی لە زایەڵەی دەنگی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز دەبێت کە لە هەموو سووچ و ئاسۆیەکدا دەنگ دەداتەوە!

کەواتــە چـارەو قــازانج و دەســتکەوتی گــەورە و ڕاســتەقینە لێرەدایە...چـارە تــەنها فرۆشـتنی ئــەم ئەمانەتەیــە بــە خـاوەنی ڕاستەقینەی خۆی.

ئـەو کەسـەی پێـی بفرۆشـێت پێـنج قـازانجی گـەورەی دەسـتگیر دەبێت:

قازانجی یەکـەم: ئـەو سـامانە فانییـەی کـە لـە نـاو دەچـێت، بـۆی دەمێنێتەوە و دەبێت بە سامانێکی هەمیشـەیی، چـونکە ئـەو تەمەنـە فانییـەی کـە پێشـکەش بـە خـوای گـەورە و زینـدووی ڕاگیرکـەری گەردوون دەکرێت و تەنها لە ڕێی ئەودا بەکار دەهێنرێـت، دەبێـت بـە تەمەنێکی هەمیشەیی، تەنانەت خولەك و سەعاتە فانییەکانی تـەمەن، کـە بەوێنـەی تـۆوی چـێنراو بـە ڕواڵـەت نـامێنن و بەهـەمان جـۆر خولـەکانی ئــەو تەمەنــەش کــە لــە پێنــاوی خوادابــەکارهێنراوە و بەسەربراوە، لەو دنیای جیهانی نەمریدا دەمیان بە گوڵزاری کامـەرانی دەپشکوێت و، بەروبوومی پێگەیشتوو پێشکەش دەکەن.

قازانجی دووەم: پاداشتەکەیەتی کە بەهەشتە.

قازانجی سێیەم: هەر ئەندام و هەستێك نرخی یـەك بـۆ هـەزار بـەرز دەبێتەوە، بۆ نموونە: (ژیری) کە ئەندام و ئـامڕازێکی مرۆڤـە، ئەگـەر نەیفرۆشیت بە خـوای گـەورە و، بـۆ نـەفس و ئارەزووەکـانی بـەکاری بهێنێـت، ئـەوا دەبێـت بـە ئەنـدامێکی نەگبـەت و بـێ توانـا و مایـەی

بێزاری! چونکە هەموو ئازارە خەمناکەکانی ڕابردوو هاودەم لەگەڵ بەڵا و گێروگرفتە ترسناکەکانی داهاتوودا دەخاتە ئەستۆی مرۆڤەوە، ئەو کاتەش پلەی (ژیری) نزم دەبێتەوە و، دەبێت بە ئەندامێکی زیانبەخش. هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینی مرۆڤی فاسق بۆ ئەوەی لە بێزارییەکانی(ژیری)ی ڕزگاری ببێت، زۆربەی جار لە دەست باری سەختی ژیان هەڵدێت و پەنا دەباتە بەر مەستی و کاری بێهوودە!

بەڵام ئەگەر ژیری بە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی بفرۆشێتەوە کە خوای گەورەیە و لە پێناوی ئەودا بەکاربهێنرێت، ئەوا دەبێت بە کلیلێك بۆ کردنەوەی خەزێنەی بێ سنوری میهرەبانیی خواوەند و گەنجینەی دانایی پەروەردگار. ئیتر بۆ هەر لایەك بڕوانیت و بەهەر چەشنێك بیربکاتەوە دانایی خواوەندە لەهەموو شت و بونەوەر و ڕووداوێکدا دەبینێت و، میهرەبانیی خوای گەورەی لەسەرانسەری بوونەوەردا بەدرەخشانی بەرچاو دەکەوێت.

بەم پێیە(ژیری) بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە پلەی ڕابەرێکی پەروەردگاری، کە پلەیەکە خاوەنەکەی بۆ کامەرانیی هەمیشەیی ئامادەدەکات.

هەروەها بۆ نموونە (چاو) کە یەکێکە لە هەستەکانی مرۆڤ و، پەنجەرەیەکە(گیان)ی مرۆڤ لێیەوە دەڕوانێتە ئەم جیهانە، ئەگەر لە ڕێی خوادا نەخرێتە کار و پێی نەفرۆشرێت و، لە پێناوی نەفس و

ئارەزووەکانیدا بەکاربهێنرێت، ئەوا بە بینینی چەند دیمەنێکی جوانی کاتی و بەسەرچوو نزمدەبێتەوە تا وەك دەڵاڵێکی ئاسایی و خزمەتکارێکی لێ دێت بۆ وورووژاندنی حەز و ئارەزووەکانی دەروون.

بەڵام ئەگەر فرۆشتت بە بەدیهێنەری خۆی و لە ڕەزامەندیی ئەودا بەکارت هێنا، ئەوا هەر ئەم (چاو)ە دەبێت بە خوێنەر و سەیرکەری کتێبی مەزنی گەردوون و، بینەری موعجیزاتی بەدیهاتووانی خوای گەورە لە بوونەوەردا، بەم جۆرە بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە پلەوپایەیەکی پیرۆز و، وەك هەنگێکی لێ دێت کە لەناو گوڵزارەکانی میهرەبانیی خواوەند لە باخچەی زەویدا دەگەڕێت و، لە هەنگوینی: (پەند و، خواناسی و، خۆشەویستی)ە نووری بینینی خوا و شایەتیدان لەسەر بوونی، هەڵدەگلۆفێت و لەناو (دڵ)ی مرۆڤی باوەڕداردا ڕۆی دەکات!

هەروەها ئەگەر هەستی (چەشتن)ت بەخوای داناو بەدیهێنەر نەفرۆشیت و، هەر تەنها بۆ نەفس و گەدە بەکاری بهێنیت، ئەوا پلەی ئەو هەستە نزمدەبێتەوە تا دەبێت بە دەرگاوانی کارگە و پشتیری (گەدە)! بەڵام ئەگەر فرۆشتت بە خوای گەورەی ڕۆزیدەر و بەخشندە، ئەوا ئەم هەستە پلەی هێندە بەرز دەبێتەوە تا دەبێت بە بینەرێکی کارامەی گەنجینەکانی میهرەبانیی خواوەند و، وای لێ دێت

که بەشوێن نیعمەتەکانی خواوەندی بەتوانا و دەستەڵاتدا بگەڕێت هەتا شوکرانە بژێرییان پێشکەش بکات.

هەموو ئەندام و هەستەکانی تری مرۆڤ بەم چەشنەن.

جا ئەی (ژیری)! بە وردی بیربکەرەوە...ئایا ئەندام و ئامێری شووم و زیانبەخش لەکوێ و، کلیلی گەنجینەی بوونەوەران لەکوێ؟

ئەی(چاو)! بەجوانی بڕوانە... دەلاڵی پلە نزم لە کوێ و، خوێنەری کتێبخانەی خواوەند لە کوێ؟

ئەی (زمان)! بە شیرینی بچێژە... ئایا دەرگاوانی کارگە و پشتیر لە کوێ و، بینەری گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند لە کوێ؟

خۆ ئەگەر بەم چەشنە پێوەر و تەرازووە قیاسی هەموو ئەندام و هەستەکانی تری مرۆڤ لەسەر ئەمانە بکەیت کە باس کران، ئەوا بە ڕاستی بۆت دەردەکەوێت کە مرۆڤی باوەڕدار تایبەتکارییەکی ئەوتۆ بەدەست دەهێنێت کە شیاوی بەهەشت بێت و، مرۆڤی کافریش ئەو توخمە دەگرێتەخۆی کە لەگەڵ دۆزەخدا بگونجێت.

ئەم ئەنجامەش، کە پاداشت و سزای هەردووکیانی تێدایە، هی ئەوەیە کە مرۆڤی باوەڕدار، بەهۆی ئیمان و باوەڕەکەیەوە، ئەمانەت و سپاردەی بەدیهێنەری خۆی پاراستووە و تەنها لەنێو بازنەی ڕەزامەندییەکانی ئەودا بەکاری هێناوە، بەڵام بابای کافر دەست

پیسیی لەو ئەمانەتە کردووە و لە پێناوی ئارەزووەکانی و خواستەکانی دەروونی بەدخواریدا بەکاری هێناوە"[1].

(زوبێر) پاش ئەوەی ئەم بابەتە کاریگەرەی خوێندەوە و، شیکردنەوەی بۆ کرد، چەند لاپەڕەیەکی دیکەی هەڵدایەوە و، وتی:

– وەك کۆتاییەك با ئەم چەند دێڕەش بخوێنینەوە، کە وەڵامێکی جیاوازە بۆ پرسیارەکەت.

لەڕاستیدا ئێمە خوازیاربووین هەرگیز ئەم باسە ژیرانەیە کۆتایی پێ نەهێنێت، (زوبێر)یش بەردەوام بوو لە خوێندنەوە:

– "پیاوێك (دە) لیرەی زێڕینی بە خزمەتگوزارەکەی خۆی دا و فەرمانی دایێ کە دەستێك جلوبەرگی لە باشترین پارچەی نایاب بۆ خۆی پێ بکڕێت، (هەزار) لیرەی زێڕینیشی بە خزمەتگوزارێکی تری دا و لیستەیەکی بچوکیشی لەگەڵیدا دایێ کە پێداویستییەکانی تێدا نووسرا بوو و، پارە و لیستەکەی خستە ناو گیرفانی ئەم خزمەتگوزارەوە و ناردی بۆ بازاڕ.

خزمەتگوزاری یەکەم بە(دە) لیرەکە دەستێك جلوبەرگی جوانی لە باشترین پارچەی نایاب پێکڕی، خزمەتگوزاری دووهەمیش چاوی لەوی تر کرد و وەك ئەوی کرد، ئەوەندەش نەفام بوو، سەیرێکی لیستەکەی نەکرد، بەڵکو هەر هەزار لیرەکەی کردە دەستی فرۆشیار

---

١– وتەکان: (وتەی شەشەم).

و داوای دەستێك جلوبەرگی پیاوانەی لێکرد، ئەم فرۆشیارە بێ ویژدانەش دەستێکی لە خراپترین جۆر بۆ هەڵبژارد، کاتێ ئەم خزمەتگوزارە بەدبەختە بۆ لای گەورەکەی گەڕایەوە و لە بەردەمیدا ڕاوەستا، گەورەکەی تابلێی قسەی پێ وت و سەرزەنشتی کرد و بەتوندیش سزای دا.

دیارە ئەو کەسەش کە خاوەنی نزمترین هەست و وریایی بێت، یەکسەر دەزانێت خزمەتگوزاری دووەهەم، کە هەزار لیرەی درایێ، بۆ ئەوە نەنێرا تا لە بازاڕ دەستێك بەرگ و پۆشاك بکڕێت، بەڵکو بۆ ئەوەی بازرگانییەکی گرنگ بەو پارەیەوە بکات.

مرۆڤیش وەهایە، کە ئەم هەموو ئامێرە مەعنەوی و لایەنە ناسکە مرۆڤانەیەی دراوەتێ، کە ئەگەر هەریەکەیان لەگەڵ ئەوەی لە ئاژەڵدایە بەراورد بکرێت، دەردەکەوێت سەد ئەوەندەی ئەوەی ئاژەڵەکان درێژتر و فراوانترن، بۆ نموونە: لە کۆی (چاو)ی مرۆڤ کە هەموو پلەکانی جوانی دەناسێت و...هەستی(چەشتن)ی کە تامی هەریەك لە خواردەمەنییە جیاجیاکان دەزانێت و لێکیان جیادەکاتەوە و...(ژیری)یەکەی کە دەڕواتە ناو کاکڵەی ڕاستییەکان و وردترین لایەنیانەوە و....(دڵ)یشی کە لەشەوق و تاسەدایە بۆ هەموو جۆرێکی بەرزی و کەماڵێك کە بۆ مرۆڤ بشێت...لەکوێ ئەمانەی مرۆڤ و هاوچەشنیان لەگەڵ ئامێرە سادەکانی ئاژەڵدا بەراورد دەکرێن، کە

ئەوپەڕی تا دوو پلە یان سیان دەردەکەون و بەوە زیاتر هەست بە شتی تر ناکەن؟ مەگەر ئەو ئەرك و فرمانە تایبەتییانەی کە بە ئەندامێك یان ئامێرێکی تایبەتی ئاژەڵێکی دیاریکراو بەخشراوە، چونکە ئەم ئامێرە کاری خۆی زۆر لە مرۆڤ باشتر دەباتە سەر لەو کارانەدا کە بەمرۆڤ نەسپێرراون"[1].

(زوبێر) کۆتا ڕستەی بە ئاوازێکی زۆر دڵڕفێن خوێندەوە و، زۆر کاریگەربووین پێی. هەر لەو ساتەدا نیگام چووەسەر (ڤامپیر نووری)، کە لەڕووخساریدا هەزاران پرسیار دەخوێندرانەوە و، لێوەکانی وشك داهاتبوون، لە نیگاکانیشیدا چەندین واتا و نهێنی بەدیدەکران، هێندە بەتوندیی لەنێو خەیاڵەکانیدا نوقومبووبوو، کە بە ئاشکرا ئاسەواری زریانەکانی ناخی بە سیمایەوە دەرکەوتبوو و، لێپرسینەوەی خۆی دەسپێکرد بوو. تا دەهات ئەم کاریگەربوونەشی زیاتر هەستپێدەکرا.

دوو گەنجەکەش بۆ ئەوەی بتوانن پێش لە لافاوی هەڵچوون و دڵتەنگیی ئەو بگرن و، هێوری بکەنەوە، هەرچی لەتوانایاندا بوایە درێغیان نەدەکرد.

(زوبێر) بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی ئەو چەند دێڕەی کە کاریگەریەکی زۆری لەسەر ئێمە جێ هێشت:

---

١- وتەکان: (وتەی بیست و سێیەم).

- "لە ڕووداوێکی ئەندێشەییدا خۆمم وەك مرۆڤێك دی کە لەسەر سەفەر بم و بۆ شوێنێکی دوور ڕەوانەکرابووم و، ڕێگەیەکی دووروودرێژم لەبەربوو. گەورەکەشم شەست لیرەی زێڕینی (هەر ڕۆژە و لیرەیەك) بۆ تەرخانکردبووم. تا ڕۆژێکیان ڕۆشتمە ئوتێلێکەوە کە مەلهای تێدا بوو، منیش (دە) لیرەم لەو کاتەدا پێبوو، هەموویانم لە یەك شەودا لەسەر مێزی قومار و لەپێناوی ناوبانگ دەستکەوتندا دۆڕاند و، بەدەستی بەتاڵ مامەوە و، هیچ کەسابەتێکم بە پارەکەمەوە نەکرد و، هیچیشم نەهێشتەوە تا پێداویستییەکانی ئەو جێگەیەمی پێ دابین بکەم کە بۆی دەڕۆم. بەکورتی: لەو چێژ و تامە ناڕەوایە جگە لە ئازار و تاوانی زۆر و زام و داخ و خەم و پەژارە هیچی ترم لێپاشەکەوت نەکرد.

کاتێ من لەم خەفەتباری و خەمخواردنەدا دەتلامەوە، پیاوێکم لێپەیدا بوو، وتی:

- (هەموو سەرمایەکەت لە دەستدا و ئێستا شایەنی سزایت. وا بەدەستی بەتاڵیش بەرەو ئەو شارەی نیازتە بۆی بڕۆیت ڕێدەگریتەبەر، جا ئەگەر وریا و خاوەنی بینایی دڵ بیت، ئەوا دەرگای پەشیمان بوونەوە و تۆبەکردن هێشتا دانەخراوە، دەتوانیت بە نیوەی قازانجی ئەو پازدە لیرەیەی کە ماوتە کەسابەتی پێوەبکەیت و، هەندێ لە پێداویستییەکانی ئەوێت بکڕیت).

که لەمەدا ڕاوێژم بە نەفسم کرد، دەبینم ڕازی نییە.. پیاوەکە وتی: "کەواتە سێیەکی". نەفسم بەمەش ڕازینەبوو. پیاوەکە وتی: "چواریەکی". دەبینم نەفسم نایەوێت لەو خووەی دووچاری بووە لابدات! پیاوەکە بە تووڕەییەوە پشتی تێکردم و ڕۆشت.

پاشان کە تەماشام کرد، وەك بڵێی هەموو شتێك گۆڕا بێت و، وەك خۆی نەمابێت، وا بوو لەبەرچاومدا! خۆمم لەناو شەمەندەفەرێکدا دی کە بەوپەڕی توندی و بەپەلە لە تونێلێکی ناوازەدا دەڕۆیشت، لەسەرسوڕماندا شپرزەبووبووم. بەڵام هیچ چارێکم نەبوو و، نەمدەتوانی نە بەلای ڕاست نە بەلای چەپدا بڕۆم. سەیر لەوەدا بوو لەم دیو و ئەو دیوی شەمەندەفەرەکەدا چەندین جۆر گوڵی ڕەنگین و جوان و سەرنجڕاکێش و بەروبووم و میوەی بەتام دیاربوون. منیش وەك مرۆڤە دەبەنگەکان دەستم بۆ بردن، تا هەندێ لەو گوڵانە بکەمەوە و لەو میوە بەتامانەش شتێکم دەستبکەوێت. بەڵام هیچم دەستنەکەوت، چونکە هەرئەوەندەی دەستم پێیان گەیشت، دڕکەکانیان بە دەستمدا چەقین و دەستیان زامدارکردم و خوێنیان لێهێنا و، شەمەندەفەرەکەش لە ڕەوتی توندوتیژی خۆیدا هەر بەردەوام بوو! بەم جۆرە، بێئەوەی هیچ سوودێکم دەستبکەوێت خۆم تووشی ئازار کرد.. فەرمانبەرێکی شەمەندەفەرەکە پێی وتم: (پێنج قروشم بدەرێ، تا ئەندازەیەکی باشت لەو گوڵ و بەروبوومانەی

دەتەوێن بۆ بکەمەوە. خۆ تۆ بەم زامانەت چەندین ئەوەندەی ئەوەی بەو پێنج قروشە دەستت دەکەون زیان دەکەیت، ئەمە سەرەڕای ئەو سزایەی کە لەسەر ئەم کارەت دەیچێژیت، چونکە بێ ڕوخسەت وەرگرتن دەستت بۆ بردوون).

لەو کاتەدا سەری دنیام لێهاتەوە یەك و بە تەواوی کەوتمە پەژارە و تەنگانەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی لای پێشەوەم کرد، تا بزانم کەی ئەم تونێلە کۆتایی پێدێت؟ دەبینم کۆتایی ئەو تونێلە چەن کون و کەلەبەر و پەنجەرە و چاڵێکن و، هەریەك لە نەفەرەکانی ئەو شەمەندەفەرە فڕێ دەدرێنە ناو یەکێك لەو کون و چاڵانەوە! لەبەرامبەر خۆیشمەوە چاڵێکم دی لە هەردوو سەریەوە بەردی وەك (کێلی گۆڕ) دانرابوون. کە لەبەردەکانی وردبوومەوە، دەبینم بە پیتی گەورە ناوی (سەعید)یان لێنووسرابوو! لە ترس و بیم و سەرسوڕماندا بە دەنگی بەرز وتم: ئەی هاوار!

کتوپڕ دەنگی ئەو پیاوەم هاتەوە گوێ کە لە دەرگای مەلهاکەدا ئامۆژگاریی زۆری کردم. گوێم لێبوو پێی وتم:

– کوڕم! ژیریت هاتەوەبەر؟ لە مەستی بێداربوویتەوە؟

وتم:

– بەڵێ، بەڵام دوای ئەوەی کار لەکار ترازا و هیچ هێز و توانا و دەسەڵاتێکم لە دەستمدا نەما.

وتی:

– تۆبە بکە و پشت بەخوا ببەستە.

وتم:

– وا کردم."[1]

## حیکمەتی ڕۆژوو چییە؟

بەڕاستی وتەکان زۆر بێوێنە و کاریگەر بوون و، من پێشتر هەرگیز بەم شێوەیە ناخم نەهەژابوو.

(ڤامپیر نووری) سەرنجی دا کە گەنجەکان هیچیان نەخواردووە، بۆیە وتی:

– ئێوە بۆچی هیچ ناخۆن؟ لەبەر ئەوەیە کە بە حەڵاڵی نازانن؟

(زوبێر) بە خەندەیەکی شیرینەوە وەڵامی دایەوە و، وتی:

– ئەستەغفیروڵڵا، هاوخوانیکردنی جەنابتان مایەی شانازیمانە، بەڵام ئێمە بەڕۆژووین.

(ڤامپیر نووری) بەم قسەیە هێندەی تر واقی وڕما و، وتی:

– ڕۆژووی چی کاکە؟ خۆ ڕەمەزانیش نییە!

(زوبێر) کەمێك بە شەرمەوە وتی:

---

١– وتەکان: (وتەی بیست و سێیەم).

– خۆتان ئەزانن، ئێمە گەنجین و، شەپۆلەکانی تاوانیش لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوین، بۆیە ئێمەش بۆ پارێزکاریی زیاتر لە گوناه و تاوان بەرۆژوو دەبین.

بێ گومان کەسێکی تاوانکاری وەك (ڤامپیر نووری)، لە ئاست ئەم وەڵامەدا بە تەواوی واقی وڕما بوو و، بەتایبەت کاتێك ئەم گەنجە پاك و بێگەردانەی بە گەنجە سەرکەش و لەڕێ لاداوەکانی دەوری بەراورد دەکرد. ئەم سەرسوڕمانەشی بە پرسیارسێك خستەڕوو و، وتی:

– بەڕاستی ناتوانم لە ئێوە تێبگەم! کاکە ئێوە لە چ مەملەکەتێکەوە هاتوون؟ فریشتەن یا چی؟ بەڵام تێگەیشتن لە حیکمەتی خۆبرسی کردن و خۆتینووکردنی ڕۆژوو زۆر سەختە، نازانم ئەمە چ سوودێکی هەیە؟

(سەعید) وەڵامی ئەم پرسیارەشی لە کتێبەکەی دەستیدا دۆزیەوە و، دەستیکرد بەخوێندنەوە:

– "گەدە"ش وەك کارگەیەك وایە کە چەندین کرێکاری کارگوزای هەیە و، لە مرۆڤیشدا گەلێ ئامێر هەن کە لەگەڵ گەدەدا پەیوەندییان هەیە، جا ئەگەر (نەفس) بە شێوەیەکی کاتی و، بۆ ماوەی مانگێك یەکی سەرقاڵی یەکانی خۆی نەخات و وازیان لێ نەهێنێت، ئەوا هەموو ئەو کارگوزار و کرێکارانە بە ئیشی خۆیەوە سەرقاڵ دەکات و، پەرستشە تایبەتییەکانی خۆیانیان لە بیردەباتەوە و، دەیانخاتە ژێر

فەرمان و دەسەڵاتی خۆیەوە، ئیتر بەم پێیە سەر لەو ئامێر و هەستانە دەشێوێنێت و، بە گرم و هۆڕی جەڕ و پێچەکانی ئەو کارگەیەو چەرە دووکەڵەکەی، حەوانەوە و ئاسوودەییان لا هەڵدەگرێت و، سەرنجی هەموویان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و، فەرمانبەرییە بەرزەکانیان–بەجۆرێکی کاتی– لەبیر دەباتەوە.

هەر لەبەر ئەم ئەنجامەش بووە کە زۆر کەس لە ئەولیا و پیاوچاکان خۆیان لەسەر خواردن و خواردنەوەی کەم ڕادەهێنا، تا بە پلەکانی (کامڵی)دا سەربکەون و بەرزببنەوە.

بەڵام بە هاتنی مانگی ڕەمەزان، ئەو کرێکارانە هەست دەکەن کە تەنها لە پێناوی ئەو کارگەیەدا دروست نەکراون، بەڵکو ئەو ئامێرو هەستانەی مرۆڤ، چەند چێژ و لە زەتێکی بەرزی ڕۆحانی و مەلائیکەت ئاسایان لەم مانگەدا دەست دەکەوێت و، لە بریی ئەو ڕابواردنە بێ تام و نزمانە، ڕوو لەو چێژ و لەزەتە ڕۆحانییە بەرزانە دەکەن.

هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینینت ئیمانداران لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا جۆرەهای جۆری نوور و بەرەکەت و دڵخۆشیی مەعنەوییان – هەر کەس بەپێی پلەی خۆی– دەستگیر دەبێت، هەر لەم مانگە پیرۆزەدا (دڵ) و (عەقڵ) و (ڕاز) و لایەنە ناسك و نیانەکانی تری هاوچەشنیان، چەندین پلە بەرزدەبنەوە و، پیت و بەرەکەتیان دەست دەکەوێت، جا هەر چەندە (گەدە) لە شین و گریان و هەنسك

هەڵکێشـاندا بێـت، ئەمانـە بـەبێ گـەردی و میهرەبانییـەوە پێـی پێدەکەنن"![1]

(ڤامپیر نووری) وتی:

– سوپاسـتان ئەکـەم بـۆ ئـەو وەڵامـە جوانـە، بـەڵام وەڵامـی ئـەو پرسیارەتان نەدامەوە کە لە سەرەتاوە پرسیم.

"بۆچی ناتوانین خوای گەورە ببینین؟"

پرسیارەکانی (ڤامپیر نووری) ئەمانەبوون:

"کە خوا هەیە، ئێمە بۆچی ناتوانین ببیینین؟ لەکوێیە؟ ئـەو چـۆن هاتۆتەبوون؟"

بەڕاستی ئێمـەش بـەم پرسـیارانەی زۆر خۆشـحاڵ بـووین، چـونکە لەمێـژبوو لـە هـزری هەموومانـدا گەڵاڵـە بوویـوون. بەدەسـتکەوتنی وەڵامەکانیشیان کەمێك بارسوکتر دەبووین.

(سەعید) جارێکی تر لاپەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدایەوە، بـەڵام ئـەم جارە بێ خوێندنەوە وەڵامی دایەوە.

خەریکبوو بەتەواوی کەمەندکێشی باسـەکە دەبـووین، جـارێکی تـر دەرگـای ژووری زیندانەکـە کرایـەوە و، ئەفسـەرێك هاتـەژوورەوە و، وتی:

---

١– مەکتوبات: (مەکتوبی بیست و نۆیەم).

- دوو تۆمەتبار لێرەن بەناوی (سەعید و زوبێر)ەوە. بەڕێوەبەر بەپەلە ناردوویەتییە شوێنیان.

ئەم جارە (ڤامپیر نووری) لە جێگەکەی ڕاپەڕی و هەستایەوە، ئەفسەرەکەش دەستبەجێ خۆی گەیاندە دەرەوە و، دەرگاکەی داخستەوە. خۆ ئەگەر (ڤامپیر نووری) دەستی پێ بکەشتایە، ڕەنگ بوو لەوێدا قوربانییەکیش بدرایە.

(ڤامپیر نووری) هێندە تووڕەبووبوو، کە ماوەیەکی پێچوو تا هێور بوویەوە، دواتر ڕووی کردەوە (سەعید) و وتی:

- دە وەرە تووڕەمەبە و، کفر مەکە و، پیاو مەکوژە... ئاخر کەسانی وەك ئەمانە ئێمە ناچار ئەکەن لەڕێی ڕاست لابەین.

کۆتا ڕستەی قسەکانی (ڤامپیر نووری) لای هەموومان زۆر سەیر بوو، چونکە هەتا ئەو ڕۆژە بەردەوام داکۆکی لە ڕێگە و شێوازی ژیانی دەکرد و، بەڕاستی هەژمار دەکرد، ڕەنگە ئەوە بۆ یەکەم جار بووبێت کە بەزاری خۆی دان بەو ڕاستییەدا بنێت.

(سەعید) بەردەوام بوو:

- ئەم پرسیارە بکەین بە چەند بەشێکەوە، باشترە، بەو جۆرەش وەڵامەکان ڕوونتر دەبن.

سەرەتا لە پرسیاری "بۆچی ناتوانین خودا ببینین؟"ەوە دەست پێ بکەین و، بابەتەکە بە نموونەیەکی مێژوویی دەخەینەڕوو.

کاتێک گەلەکەی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) پێی دەڵێن:

– ئەی موسا تا پەروەردگارمان پیشان نەدەیت، باوەڕت پێ ناهێنین.

حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی:

– خوای گەورە بەهەموو شتێك بینایە، بەڵام کەس ناتوانێت زاتی موبارەکی ئەو ببینێت.

ئەوانیش وتویانە:

– بەڵام ئێمە باوەڕ بە خودایەك ناهێنین کە نەتوانین ببینین.

هاوشێوەی ئەم پێشهاتە لە هەموو سەردەمێکدا دووبارە بووەتەوە و، لە سەردەمی ئێستەشدا نموونەی زۆرە، تەنانەت چەندین مامۆستا ئەم پرسیارەیان لە لای خوێنکارەکانیان وروژاندووە و، وەڵامی گەلەکەی موسایان داوە بەگوێیاندا.

مامۆستایەکی بێباوەڕ بەخوێندکارەکانی وتوە:

– نوقڵ و چکلێت لە خوا داوابکەن.

منداڵە بێ تاوان و پاکوبێگەردەکانیش کە پاڕاونەتەوە خوا چکلێتیان پێببەخشێت، ئەو مامۆستا یاخییە پێی وتوون:

– بینیتان پێی نەبەخشین، لەبەرئەوەی –حاشا– خوا بوونی نییە و، پاشان پێی وتوون: ئێستە لەمن داوابکەن، و پاشان هەندێك لەو

نوقڵ و چکلێتەی پێداون کە پێشتر بۆ ئەم مەبەستە کڕیبووی و، پێی وتون:

– سەیرکەن، ئێوە هەم دەتوانن بمبینن و، هەم کە داواتان لێ کردم، پێم بەخشین. ئەگەر پەروەردگار هەبووایە دەتانتوانی ببینن و، گوێبستی داواکارییەکانیشتان دەبوو.

هەروەها مامۆستایەکی نادڵسۆز بەهەمان مەبەست بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز هۆشی خوێنکارەکانی شێواندووە، کاتێك لە پۆلدا لێی پرسیون:

– ئایا من دەبینن؟

بێگومان وتویانە (بەڵێ)، ئەویش وتویەتی ئەمە لەبەرئەوەیە کە من هەم و بوونم هەیە، بەڵام ئایا خوا دەبینرێت؟

خوێنکارەکانیش بە (نەخێر) وەڵامیان داوەتەوە، بەڵام ئەمەی بەشێوەیەك لێکداوەتەوە، کە ئەگەر خوا هەیە بۆچی ناتوانین ببینین، کەواتە –حاشا– نیە، چونکە ناتوانین ببینین. بەم شێوەیەش نیازی خراپ و نەفامیی خۆی بەسەر خوێندکارەکانیدا سەپاندووە و، فریوی داون.

بێگومان هەندێك لە مرۆڤەکان هاوشێوەی ئێوە مەراقی دەستکەوتنی وەڵامی ئەم پرسیارە دەکەن، لەبەرامبەریشدا هەندێك

کەسی یاخیی و بەدکار بەمەبەستی فریودان و چەواشەکردنیان وەك ئەو مامۆستا نەفامانە ئەو وەلامانە دەدەنەوە.

بەلام ئاشکرایە کە بینین بەلگە نییە لەسەر بوون، نەبینینیش یا بەهۆی لاوازیی ئاستی بینینەوەیە، یاخود بەهۆی وردبینی تەنەکەوەیە، خۆ ئێمە ناتوانین بەکتریا و میکرۆب و زیندەوەرە وردیلەکان ببینین، بەلام ناشتوانین نکوڵیی لە بوونیان بکەین. ناتوانین عەقڵ و بیروهۆش و ژیری ببینین، بەلام هەرگیز ناتوانین نکوڵیی لە بوونی بکەین و بڵێین ئێمە بێمێشکین، بۆ نموونە زۆرمان وڵاتی (چین)ی نەدیوە، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ناتەوانێت بڵێت کە وڵاتێکی وەها بوونی نییە، تەنها بەهۆی ئەوەی ئێمە بەچاوی خۆمان نەمان دیوە و، سەردانمان نەکردووە.

بێگومان خوایەك هەیە کە هەموو ئەم بوونەی فەراهەمهێناوە و، هەر بە حیکمەت و دانایی خۆیشی جۆرە بینایییەکی پێ نەبەخشیوین کە بتوانین بەهۆیەوە زاتی موبارەکی ببینین، بەلام بیروهۆش و مێشکێکی پێ بەخشیوین، کە بتوانین بەهۆیەوە ئاسەواری بوونی مەزنی هەست پێ بکەین و، بیناسینەوە.

ئاشکرایە هەندێك شت بە چاو نا، بەڵکو بە بیروهۆش هەستیان پێ دەکرێت، هەندێکیش بە زمان و، هەندێکیش بە گوێ. بۆ نموونە خوێی چێشت بە زمان و، دەنگەکان بە گوێ و، چەمك و بابەتە

مەعنەوییەکانیش بە مێشك. بەویستی خوای گەورە هەر باوەڕدارێك دوامەنزڵگەی بەهەشت بێت، بە دیداری شاد دەبێت.

## تایبەتمەندیی و سیفەتەکانی خوای گەورە چین؟

بەشی دووەمی پرسیارەکە بەم شێوەیە بوو: "دەبێت تایبەتمەندیی و سروشتی زاتی پەروەردگار چۆن بێت؟" سەعید لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا وتی:

– هەروەك چۆن ناتوانین پەروەردگار ببینین، بەهەمان شێوەش ناتوانین بە تەواویی لە پێکهاتەی بوونی زاتی موبارەکی تێبگەین، چونکە ئەو بەدیهێنەرە و ئێمەش بەدیهێنراو، بوونی بەدیهێنراویش لە ڕەگەزی بەدیهێنەر نییە، هەروەك چۆن باڵەخانەیەکی بنیاتنراو لە ڕەگەزی ئەندازیاری بنیاتنەری نییە، کەواتە ئەگەر نەتوانین ئەندازیارەکە بچوێنین بە باڵەخانەکە، ئەوا ناتوانین زاتی بەدیهێنەریش بە بەدیهێنراوان بچوێنین. سەنعەتێکیش بۆ سەنعاتکار نایەتە بوون، بەڵام هیچ سەنعەتێك ناتوانێت سەنعاتکار وەسف بکات.

لەنێوان فەراهەمهێنراو و فەراهەمهێنەردا (واتە هۆکار و سازێنەری هۆکارەکە) هەمیشە جیاوازییەکی زۆر هەیە. هەروەك چۆن کتێبێك ناتوانێت خودی خۆی بنووسێتەوە، بەهەمان شێوەش کورسییەکیش لەخۆیەوە دروست نابێت، هەموو شتێك وەستایەکی هەیە، بەڵام هەروەك چۆن هەرگیز کتێبەکە لە ڕەگەز و پێکهاتەی نووسەرەکەی

نییــه، ئەوەشــی مێــزێکیش دروســت دەکــات لــه ڕەگــەزی مــادەی پێکهێنەری مێزەکە نییە؛ کەواتە هــەر بــەم شـێوەیە زاتــی موبــارەکی (الله) نه لـه ئێمـه و نـه لـه هـیچ بەدیهێنراوێکی دیکـه ناچێت و، بـەو پێیـەی ئێمـەش یـەکێکین لـه سـەنعەتەکانی زاتــی موبــارەکی، ئــەوا ناتوانین هەرگیز پەی بە پێکهاتەی بوونی ببەین.

بۆ وەڵامی پرسیاری "کـێ پـەروەردگاری -حاشـا- بـەدیهێناوە؟" دەگەڕێینەوە بۆ شیکردنەوەی زانا و بیرمەندی مەزن مامۆستا (محمـد کرکنجی)، کاتێك دەڵێت: "شەمەندەفەرێك لە هزرتاندا وێنابکـەن، کـە هەشتا فارگۆنی هەبێت و، هەر یەك لەم فارگۆنانە ئەوی دیکە بـە دوی خۆیــدا ڕابکێشــێت، بــەڵام کــە دەگەینــە بەشــی پێشــەوەی شەمەندەفەرەکە، کە بزوێنەرەکەیە، ناگونجێت بڵێین ئـەی کـێ یـان چی بزوێنەرەکە ڕادەکێشێت. بێگومان ئەگەر بزوێنەرەکە نەبێت، ئەوا هەموو فارگۆنەکانی دیکەش لە جوڵە دەوەستن و، سیسـتمی کارەکـە تێکدەچێت.

هــەروەها ئەگــەر پرســیار لــەبارەی چـۆنێتی پێکهــاتنی کلۆیــەك شەکرەوە بکرێت، لەوەڵامدا دەوترێت کـه لـه کارگـەی بەرهـەمهێنانی شــەکر و بەرهەمەکانیــدا بەرهەمــدەهێنرێت و، ئەگــەر لــه بــارەی سەرچاوەی ئامێر و کەلوپەلەکانی کارگەکەوە بپرسین، ئەوا دەوترێـت کە ئەوانیش لە کارگەی تایبەت بە دروستکردنی ئەو جۆرە ئامێرانـەدا

دروستکراون. ئەگەر یەکێك بپرسێت لەوەی کەواتە ئەی ئەو کارگانە چۆن پێکهاتوون و.. بەمشێوە پرسیار پاش پرسیار بەشێوەکی بێ کۆتایی و ئەنجام بەردەوام دەبێت.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە میوەیەکی وەك سێو لە درەختی سێوەوە بەرهەمدێت، ئەم درەختەش لە ڕیزی بوونەوەرانی کارگەی بەدیهێنراودایە و، خۆ ئەگەر بەدیهێنانی سێو و درەختەکەش نەدرێتە پاڵ خاوەنی زانست و توانای بێکۆتا، ئەوا ئەم کارگەی بەدیهێنراوانەش دەبوو بگێڕدرێتەوە بۆ کارگەیەکی تایبەتمەندتر و، ئەویش بۆ کارگەیەکی تر و، بەم جۆرە بێ کۆتایە بەردەوام دەبوو، بێ ئەوەی بگاتە بنبەست و سەرچاوەی ڕەها.

کە دەبینین پێنووسێك نووسینێکی نەخشاندووە و، خودی پێنووسەکەش بە دەست گیراوە و، ئەو دەستەش بێگومان بە لاشەیەکەوەیە، ناتوانین بڵێین بە تەواویی سەرچاوەی ڕاستەقینەی نووسینەکەمان دیاریکردووە.

سەربازێك فەرمان لە ئەفسەر وەردەگرێت و، ئەویش لە ئەفسەری سەروو خۆی و، بەم شێوەیە تا دەگاتە باڵاترین فەرماندە و، ئەویش لە پاشا یا سەرۆکی وڵاتەوە، خۆ ناکرێت بڵێین ئەی پاشا فەرمان لە کێوە وەردەگرێت؟ چونکە ئەگەر ئەویش فەرمان لە یەکێکی دیکەوە وەربگرێت، ناتوانین پێی بڵێین پاشا. بەڵکو کە دەڵێین (پاشا)،

لەهزرماندا وێنای زاتێك دەكەین كە فەماندەدات، بەڵام فەرمان لەكەسی تر وەرناگرێت.

لەم نموونەیەوە كە بە ئاشكرا ڕێكخراویی و قەشەنگیی و مەزنیی ڕێساكانی گەردوون وێنادەكات، دەسەلمێت كە پێویستە هەموو جوانیی و ڕێكخراویی و ناوازەییەكی گەردوون بدرێتەپاڵ ئەو زاتە زانا و دانا و دەسەڵاتدار و بێ هاوتایەی، كە بەشێوەیەكی حاشاهەڵنەگر مەزنیی و ناوازەیی خۆی لەڕێی ناو و سیفەتەكانییەوە نەخشاندووە".

## باسەكە زۆر كاریگەر بوو:

كات نزیكی ئێوارە بوو، هەم ئێمە و هەم (ڤامپیر نووری)یش زۆر بە باسەكە كاریگەر بووبووین و، چێژێكی زۆرمان دەبینی، بەڵام گەنجەكان زۆر ماندوو بوون، چونكە بە ڕۆژووش بوون. (ڤامپیر نووری)یش ئەمەی لەبەرچاو گرت و، وتی:

– هەر لەشساغ و سەلامەت بن، بەڕاستی لەژیانمدا گوێبیستی باسی وا بەسوود و پڕبایەخ نەبووم، ڕاستییەكەی زۆر ئاسوودە بووین، دەرگای جیهانێكی تەواو نوێتان بۆ كردمەوە و، باس و خواسی نوێ لە ناخما گوزەرئەكەن، چەندین پرسیارتان لا گەڵاڵە كردم و، بابەتی زۆر گرنگ هەن كە پێویستە بۆمان باس بكەن، بەڵام هێندە بۆ ئەمڕۆ بەسە. بەڕاستی ناتوانم چیتر بەرگەبگرم، پێویستە

ئەوەی کە بۆتان باسکردین، بەباشیی بیریان لێ بکەمەوە و، سبەی لەم خاڵەوە دەستپێدەکەینەوە.

پاشان هاواری کرد بەسەر پیاوەکانی دەوریدا:

– سەیرکەن ها، ئەم هاوڕێیانە بەڕۆژووبوون، بۆیە خوانێکی شیاویان بۆ حازر کەن.

لە چوارچێوەی ئەم زیندانە تەسك و تارەدا جیهانێکی ناوازەمان بۆ خۆمان سازاندبوو و، ئەو بابەتانەی باسدەکران چێژێکی ڕۆحیی و کاریگەرییەکی وەهایان لە دڵ و دەروونی هەمواندا جێ هێشتبوو، کە کەسمان ئارەزوومان نەدەکرد باسەکان کۆتاییان پێ بێت. لەڕاستیدا ئەو زیندانە لەو کاتەدا بۆ ئێمە ئارامگەی سەربەستیی بوو، کە تێیدا دڵ و دەروونە وێڵ و سەرگەردانەکان ئاسوودە دەبوون.

بەڕاستی مرۆڤگەلێکی زۆر هەن، کە هەموو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی ئەم سەردەمە شك دەبەن، بەڵام هەرگیز ناگەنە کەناری ئاسوودەیی و ئارامیی، هەرچەندە بە لاشە زۆر ئاسوودە بن؛ چونکە ئاسوودەیی ڕاستەقینە سەرچاوەکەی دڵ و دەروونە، ئێمەش لە نزیکی کەنارەکانی ئارامیی مەلەمان دەرکرد و، هێندەی باڵندە ئازادەکان هەستمان بە سەربەستی دەکرد...

کەواتە سەرچاوەی کانیاوی خۆشبەختیی و بەختەوەری ڕاستەقینە نە لە دوایین مۆدێلی ئۆتومبێل و، نە لە ماڵ و سامانی دنیادایە، بەڵکو لە دڵ و دەروونداییە.

من ئەو کاتە لەم ڕاستییە دڵنیابووم، وەك ئەوەی خوای گەورە ئەم گەنجانەی وەك دوایین تروسکەی میهرەبانی بۆ ئێمە ڕەوانە کردبێت. خۆ ئەگەر چەند نموونەیەکیان لە کۆمەڵگەدا هەبووایە، ئەوا هەزاران گەنجی وەك مـن ئـاوا چـارەڕەش نـەدەبوون و، بـەم ڕۆژگـارە نەدەگەیشتن.

ڕۆژی دواتـر سـەرلەنوێ پاسـەوانەکە هاتـەوە بەشـوێن (سـەعد و زوبێـر)دا و، (قـامیر نـووری)یش وەك ڕۆژی پێشـوو بەتوڕەییـەوە هاواری کرد بەسەریدا.

بەڵام گەنجەکان وەك هەمیشە هێمن بوون و، (سەعید) وتی:

– بـەڕێزم، ڕێمـان بـدە بـا بـڕۆین، لەوانەشـە هـەواڵێکی خۆشمـان بدەنێ، باشتر وایـە هـەموو ڕووداو و پێشـهاتێکی ژیـان بەشـێوەیەکی ئەرێنیی و ئومێدەوارانە لێکبدەینەوە.

دوو گەنجەکـە بـەدوای یەکـدا ڕۆیشـتن و، (قـامیر نـووری)یش وەستابوو، دیاربوو زۆر بەئەسـتەم دەیتـوانی بەسـەر تووڕەییەکەیـدا زاڵ بێت، وتی:

- ئاممـان، ئـەم گەنجانـەمان لەدەسـت دەرنەكـەن، پـەنجا سـاڵی تەمەنم زایەكرد، بەڵام ئەمە یەكەم جارمە كەسانی لەم جـۆرە بناسـم، زۆر شت هەیە كە دەمەوێت فێرببم لێیانەوە، تەنانەت ئەمشەو بـەهیچ شێوەیەك نەنوستووم و، بیرم لە وتەكانیان كردووەتەوە.

دنیایەك پرسیارم هەیە، دەبێت وەڵامم بدەنەوە.

پاشان بە پاسەوانەكەی وت:

- بڕوانـە كـوڕە، ئـەو گەنجانـە نەبەنـە ژوورێكـی تـر هـا، ئـەوان ئەهێننەوە ئێرە، تێگەیشتی؟

پاسەوانەكەش سەری داخست و وتی: "باشە گەورەم".

# بەشی حەوتەم

## (زوبێر) و (سەعید)

## سەرلەنوێ گەڕانەوە ژوورەکەمان



ئەوەی لێی دەترساین، ڕووی نەدا و، کەمێك دواتر دووگەنجەکە هاتنەوە و، بەبینینیان ئاسوودە بووین.

(ڤامپیر نووری)بە مەراقەوە وتی:

– چی بوو؟

(سەعید) وتی:

– لەهەموو شتێکدا خێرێك هەیە، سوپاس بۆخوا هەروەهاش بوو. بەڕێوەبەری زیندان ئێمەی بۆ سوپاسکردن بانگکردبوو.

ئێمەش هەموومان بەم قسەیە واقمان وڕمابوو و، (ڤامپیر نووری)یش وەك ئێمە سەری سوڕمابوو. لەناکاو وتی:

- چی؟

(زوبێر) دەستی کرد بەگێڕانەوەی باسەکە:

- لەگەڵ کوڕی کاکی بەڕێوەبەردا لە هەمان پۆلدا خوێندکار بووین و، کوڕەکەی زۆر بێ دین بوو و، ماڵی بەجێ هێشتبوو. گەنجێك بوو کە ڕۆژگاری بە خۆشڕابواردن و سەرکەشییەوە بەسەر دەبرد، بەنیاز بوو دەستبەرداری خوێندنیش بێت.

جارێك بەڕێکەوت گفتوگۆیەکمان کرد، پاش ئەوەش بووینە هاوڕێ و، زوو زوو بانگێشتمان دەکرد، بۆ وانە ئاینییەکانمان.

ئەو بابەتانەی جێی هەڵوێستە لەسەرکردن بوون، گفتوگۆمان لەبارەوە دەکردن و، لەماوەیەکی زۆر کورتدا کاریگەری باسەکان بەسەریەوە دیاری دا و، گەڕایەوە سەر ڕێی ڕاست و، نوێژ و پەرستشەکانی خۆی بەجێ دەهێنا و، دواتر خۆی گورجکردەوە بۆ قوتابخانە و خوێندن.

دوێنێ گەڕاوەتەوە ماڵەوە و دەستی دایك و باوکی ماچ کردووە، بێ گومان کاکی بەڕێوەبەریش بەمە زۆر دڵخۆش بووە و، بە مەبەستی سوپاسکردن ئێمەی بانگکردبوو.

لەئاست ئەم ڕووداوە پڕمانایەدا واقمان وڕمابوو.. گەنجێکی سەرکەش و یاخی، کە دەسبەرداری خوێندن بووە و، دڵی دایك و باوکی زیزکردووە، ئێستە ڕێی ڕاست و سەرفرازیی دۆزیوەتەوە، زۆر

مایەی خۆشحاڵیمان بوو. بەڕاستی جێی داخ بوو کە کەسانی وەك ئەم گەنجانە چاکەخواز و بەهرەمەند لە سوچی زینداندا بن.

(ڤامپیر نووری) هەستایەوە و وتی:

– گوێتـان لێبـوو کوڕینـە؟ بەڕاسـتی قارەمـانێتی ڕاسـتەقینە بـەم جۆرە ئەبێت.. تەنانەت پێویستە دەستی ئەم گەنجانە مـاچ بکرێـت، مەگـەر لـەڕزگارکردنی مرۆڤـەکان لـە زەلکـاوی نـەزانیی و نـەفامی قارەمانییەتیەکی مەزنتر هەیە؟!

(ڤامپیر نووری) بۆ یەکەم جار چاوەکانی لێوانلێوبوون لـە فرمێسـك و، لێوەکانی بەئاشکرا دەلـەرزین و، دۆش دامـا بـوو و، لـەجێی خـۆی دانیشت. بێدەنگییـەکی سـەیر بـاڵی بەسـەر ژوورەکەمانـدا کێشـابوو، (ڤامپیر نووری)یەك بەو هەموو هەیبەت و جەربەزەییەوە ئاوا کاریگـەر بووە، وادیاربوو ئەمە بۆ یەکەم جار بوو لە ژیانیدا دڵە بەردئاسا و پـڕ لە کینەکەی هێندە کاریگەر بووبێت.

(زوبێر) بەدەوام بوو:

– ویسـتی خـەڵاتمان بکـات، بـەڵام ئێمـە ڕازی نـەبووین، چـونکە لـەپێناو ڕەزامەنـدیی پـەروەردگاردا ئـەم خزمەتـە دەکـەین، هـەروەها دەیویست ژووری زیندانمان بۆ گۆڕێت، بەڵام بـەوەش قایـل نـەبووین، چونکە تـا دۆسـتگەلێکی وەك ئێـوە و کـاك نـووری لـەم ژوورەدا بـن، چۆن بتوانین بچینە ژوورێکی دیکە.

لەئاست ئەم هەڵوێستە جوانەیاندا هەم ئێمە و هەم (ڤامپیر نووری)یش زۆر مەمنون بووین. ئەو دوو گەنجە وەك ئەوەی لە ناخی ئێمە شارەزا بن و، بزانن ئێمە چ بابەتێکمان بەلاوە گرنگە، ئەوانەیان باسدەکرد، ئەمەش خۆشویستنیانی لە دڵماندا چەند قات کردەوە.

ئەو ڕۆژە سەرلەنوێ باسێکی تریان خستەڕوو و، (ڤامپیر نووری)یش هاوشێوەی ئێمە زۆر بەپەرۆشەوە بوو بۆ دەستکەوتنی وەلامی نوێ.

(ڤامپیر نووری) سەرەتا خەونێکی زۆر خۆشی خۆیی بۆ گێڕاینەوە، کە کورتەی ناوەڕۆکەکەی بەمشێوەیە بوو:

(ڤامپیر نووری) دەیەوێت لە لوتکەیەکی بەرزەوە بچێت بۆ لوتکەیەکی دیکە، بەڵام ترس بووەتە کۆسپی بەردەم ئەم کارەی، چونکە بەرزاییەکە زۆر بڵند و بالایە و، هەلی زیندوومانەوە پاش کەوتنەخوارەوە مەحاڵە. لەوبەرەوە کەسێك گوریسێکی بۆ هەڵدەدات و، (ڤامپیر نووری)یش گوریسەکە دەگرێتەوە، لە پاش ئەمە مشتومڕێکی زۆر سەیر دەستپێدەکات و، (ڤامپیر نووری) بە ترس و شڵەژاویی و ئارەوەقەوە بێداردەبێتەوە.

(سەعید)یش بەم جۆرە ڕاڤەی خەوەکەی (ڤامپیر نووری) کرد:

– ماشائەڵلا، خەونێکی زۆر خۆشە.. مژدەی ژینێکی نوێیە بۆت، پیرۆزبابیتان لێ دەکەم، چونکە پاش کۆتاییهاتنی سەرجەم

مشتومڕەکان و، بڕینی هەموو سەختی و نشێوەکان دەگەنە هەق و ڕاستیی. ئەمەش لە ویست و خولیای تێگەیشتنتاندا بەدی دەکرێت.

ئەم وتەیە (ڤامپیر نووری)ی زۆر خۆشحاڵ کرد.

## پرسیار و وەڵامەکان:

(ڤامپیر نووری) سەرلەنوێ پرسیارە شەپۆلئاساکانی خستەڕوو:

– ئێستە تێگەیشتین و دڵنیابووین کە پەروەردگار ئەم بوونەوەرەی بەدیهێناوە و، هەر خۆی حاکم و ڕێکخەر و خاوەنی وردیلەترین پێکهێنەرەکانیەتی و، چەند بەخششێکی ناوازەی پێبەخشیوین. باشە بۆچی لەپاش ئەم هەموو بەخشش و میهرەبانییە، ڕێمان نادات بە ئارەزووی خۆمان بژین و، فەرمانی کردووە کە بیپەرستین. خواپەرستیی بکەین یا نەیکەین چ جیاوازییەك دێنێتەکایەوە؟ ئایا ئەو پێویستی بەم پەرستشەی ئێمە هەیە؟ هەمووان بە سەرنجەوە چاوەڕێی وەڵام بوون.

(سەعید)یش چەند لاپەڕەیەکی ئەو کتێبە بەرگ سوورەی هەڵدایەوە کە لەبەردەمیدا بوو و، جارێکی تر هەم دەیخوێندەوە و هەم بابەتەکانی شیدەکردەوە.

– "هەرگیز خوای گەورە، کە هەر لە زاتی خۆیدا دەوڵەمەند و بەدەسەڵاتە، نەك هەر تەنها پێویستی بە پەرستشی تۆی مرۆڤ نییە، تەنانەت پێویستی بە هیچ شتێك نییە. بەڵکو هەر تەنها تۆی مرۆڤی

هەژاریت کە پێویستت بە پەرستنی ئەوە! چونکە تۆ دووچاری نەخۆشییەکی مەعنەوەی بوویت و، پەرستشی ئەو خواوەندەش مەڵهەمێکی سارێژکاری نەخۆشییەکانی (گیان) و ئازارەکانی (زات)ی مرۆڤانەی تۆیە.

ئەمەشمان لە گەڵ پەیامدا چەسپاندووە و، بەم شێوەیەی خوارەوە نموونەمان لەسەر هێناوەتەوە:

ئەگەر پزیشکێکی میهرەبان بە دڵسۆزی و جەختەوە داوای خواردنی دەرمانێکی تایبەتی لە نەخۆشێکی خۆی بکات و، پێی بڵێت: ئەم دەرمانە شیفابەخشە بخۆ، کە تایبەتە بە نەخۆشییەکەتەوە، کەچی نەخۆشەکە لەوەڵامدا پێی بڵێت: تۆ چ پێویستییەکت بەم دەرمانەیە وا بە گەرمی داوای خواردنی دەرمانی وام لێدەکەیت؟ تۆ کارت بەسەرمەوە چییە؟

ئایا لەم وەڵامەوە مەودای گەوجی و ڕادەی بێنرخیی قسەی بابای نەخۆشت بۆ دەرناکەوێ؟" [1].

پەرستش چەندین سوودی جەستەیی و دەروونیی لە ژمارەنەهاتووی بۆ مرۆڤ هەیە، ئەگەر (ڕۆژوو) بەنموونە وەربگرین، دەبینین لەم سەردەمەدا سوودە جەستەییکانی ڕۆژوو لەلایەن پسپۆڕ و شارەزایانی بواری تەندروستییەوە سەلێمنراون، تەنانەت لە هەندێك

---

١- بریسکەکان: (بریسکەی بیست و سێیەم).

وڵاتـی ئەورووپییـدا لـە بنکـە تەندروسـتییەکاندا وەك چارەسـەر بـۆ چەندین نەخۆشی دیاری دەکرێت.

ڕۆژوو کۆئەنـدامی هـەرس و جگـەر بەتـەواوی دەحەوێنێتـەوە و، کاریگـەریی زۆر بەرچـاوی هەیـە لەسـەر هەستەوەرە دەمارەکـانی ماسـولکەکان و ئێسـك و، چارەسـەرێکی کارایـە بـۆ کـەمخوێنی و، دەمارەخانــەکان لــە ڕەقبــوون دەپارێزێــت و، ماســولکەکانی دڵ دەحەوێنێتەوە.

هەروەها (دەزنوێژ) بە کەمکردنەوەی بارگەکارەباییـەکان، هەسـتی توڕەیی و هەڵچون لە مرۆڤدا کەمدەکاتەوە و، ئارامشی دەروونیی پـێ دەبەخشـێت و، کۆئەنـدامی بـەرگری لـەش بـەهێز دەکـات. ئەمـە سەرەڕای پاکوخاوێنڕاگرتنی جەستە.

پێسـتی مـرۆڤ بـە دەزنوێـژ پـاکتر و بەڕەونـەقتر دەبێـت، تەنانـەت پسۆڕانی بواری جوانکاری ئامۆژگارییمان دەکەن، ڕۆژانە چەند جارێك ڕووخسـارمان بـە ئـاو بشـۆین، بـەڵام ئێمـە بەشـێوەیەکی ئاسـایی لەمیانەی دەزنوێژەوە ئەم سوودانە بەدەستدێنین.

بێگومـان (نوێـژ)یش جـۆرە وەرزشـێکی سـادە و بەسـوودە بـۆ تەندروستی مرۆڤ. لـە نـوێترین لێکۆڵینەوەکانـدا سـەلمێندراوە کـە لـە دەمەوبەیان و پـێش خۆرهـەڵاتن (واتـە کـاتی نوێـژی بـەیانی)، گـازی (ئۆزۆن) لە هەوادا هەیە، کە جـۆرە گـازێکی زۆر بەسـوودە و، ئاسـتی

چالاکیی جەستەیی و هزریی مرۆڤ بەرزدەکاتەوە. شایەنی باسە هەر بەپێی ئەو لێکۆلینەوانە دەرکەوتووە کە ئەم گازە تەنها لەو ماوەیەی بەیانیدا هەیە و، لەگەلّ خۆرهەلاّتندا نامێنێت.

ئەو وەرزشی (یۆگا)یەی لەم سەردەمەدا زۆر باوە و، بۆ حەوانەی دەروون و جەستە ئەنجامدەدرێت، ئێمە لەمیانەی نوێژەکەماندا ئەنجامی دەدەین.

ئەگەر ئەم سوودانە لەبەرچاوبگرین، ئەوا بە ڕوونیی تێدەگەین کە خوای گەورە پێویستی بە عیبادەت و بەندایەتی ئێمە نییە.

بۆ نموونە خوای گەورە مەیخواردنەوە و تاوانی داوێن پیسیی و قوماری لەسەر مرۆڤەکان حەرامکردووە، بەلاّم ئایا بۆ ناپرسین هۆکاری ئەم حەرامکردنە چییە؟ ئایا -حاشا- بەمە ستەم لە مرۆڤەکان دەکات و، هۆکاری حەوانەوە و پشوویان لێدەشێوێنێت؟ بێگومان نەخێر، بەلّکو بۆ پاراستنی لەشە لە زیانەکانیان، پزیشکانی ئەم سەردەمەش بەردەوام لە باسی زیانەکانی ئەو شتانەدان لەسەر تەندروستیی جەستەی مرۆڤ، جگە لە زیانەکانی لەسەر لایەنی کۆمەلاّیەتی. ئەو هاوسەرانەی مەی دەخۆنەوە و، یاری قومار دەکەن، هەمیشە سەرقالّی یەکتر فریودانن و، ئەو پشێویی و ناجێگیرییەش کە بە ڕەفتارەکانیانەوە دەردەکەوێت، کاریگەریی زۆر خراپی لەسەر

داهاتووی منداڵەکانیان دەبێت و، چەندین کێشە و دەردیسەری لێدەکەوێتەوە.

بەو جۆرە خوای گەورە کۆمەڵێك شتی لە بازنەی حەرام و نەشیاودا دیاریکردووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە تەندروست و ئاسوودە بێت و، لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا سەرکەوتوو و بەختەوەر بێت، لەکۆتاییشدا مرۆڤ ئەم فەرمانی خواپەرستییە جێبەجێدەکات، چونکە مرۆڤ بە لەخواترسان و، تێگەیشتن لەو ڕاستییەی بەدیهێنەرێکی هەیە، کە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر کردەوەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات، کڕنووشی بۆ دەبات. هەروەها مەی ناخواتەوە و، قومار ناکات و، ستەم لە کەس ناکات و، خۆی لە هەموو ئەو کردەوانە دەپارێزێت کە زیانیان بۆ کۆمەڵگە هەبێت.

## زەکات بنەمای یەکسانیی و دادپەروەریی دەپارێزێت:

(زەکات) جۆرێکی دیکەی پەرستشە، کە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دەپارێزێت و، بەهۆیەوە موسوڵمان ئەگەر ماڵەکەی بکات بە چل بەشەوە، پێویستە بەشێکی ببەخشێت بە هەژاران. خۆ ئەگەر بەهۆی ترس و گوێڕایەڵیی فەرمانیی پەروەردگارەوە نەبێت، چ مرۆڤێك ئامادەیە بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆی بەو شێوەیە ببەخشێت؟!

ئایا هیچ کام لەو سیستمانەی بانگەشەی دادپەروەری کۆمەڵایەتییان دەکرد، توانیان دروشمەکانیان بە کردایی بهێننەدی؟ بێگومان نەخێر. بەڵام پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: "هەرکەسێك خۆی تێر و، دراوسێکەی برسی بێت، ئەوا لە ئێمە نییە"، بەمەش هەموو ساماندار و خاوەن داهات و سەرمایەکان هاندەدات کە یارمەتی هەژار و بێچارەکان بدەن.

بەڵام پێویستە ئەم پەرستشانە تەنها لەپێناو سوودە جەستەیی و تەندروستییەکانیاندا نا، بەڵکو بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگار ئەنجامیان بدەین و، هەر ئەم کاتەش وەك پەرستشی ڕاستەقینە هەژمار دەکرێن.

بەجێهێنان و پابەندبوون بە پەرستشەکانەوە پێویستی بە باوەڕی پتەوە بە پەروەردگار هەیە، خۆ ئەگەر بە بەدیهێنراوەکان و بەخششەکانیی ئاشنایت، ئەوا پێویستە فەرمانەکان و ئەو کارانەی نەهی لێکردوون بناسیتەوە. خوای گەورە لە بەرامبەر ئەو هەموو نیعمەتە نەبڕاوە و لەژمارە نەهاتووەی پێی بەخشیوین، فەرمانی پێکردووین سوپاسگوزاری بین، ئەم سوپاسگوزارییەش لە میانەی پەرستشەکانەوە دەبێت. کەواتە کە دەبینین ماڵ و سامانی پێبەخشیوین پێویستە لەبەرامبەردا زەکات ببەخشین و، بۆئەوەی بەباشیی پێزانینی خۆمان بەرامبەر بەخششەکانی خوای گەورە

دەربڕین، پێویستە خۆمان لە خواردن و خواردنەوە بەدوور بگرین و بەڕۆژوو بین. سوپاسگوزاریی مرۆڤ تەنها لەڕێی پەرستشەکان و خواپەرستیی و بەندایەتییەوە دەبێت و، لەم ڕێیەشەوە لە خوای گەورە نزیکتر دەبێتەوە.

بۆنموونە ئەگەر کەسێك هۆکارەکانی ژیانێکی شەرەفمەندانەتان بۆ دابین بکات و، بەردەوام دیاریتان پێشکەش بکات، ئایا سوپاسگوزاری دەبن، یاخود پێنەزان؟

دەبینن پەروەردگاری میهرەبان ئەم هەموو بەخششە لەژمارەنەهاتووەی پێبەخشیوین، کەواتە پێویستە بەردەوام سوپاسگوزاری بین، لەسەر ئەم هەموو نیعمەتە کۆتانەهاتووە.

ئایا ئەگەر ئەو هەوایەی بەردەوام لە هەناسەداندا بەکاریدێنین و، ساتێك ناتوانین بە بێبوونیی بژین، بە پارە بووایە، دەمانتوانی بەردەوامیی بەژیان بدەین؟ کەواتە تەنها پەرستشەکان وەك سادەترین جۆری سوپاسگوزاریی شك دەبەین و، لەمەشەوە دەتوانین بڵێین کە ئێمەی مرۆڤ پێویستمان بە پەرستشە و، فەرمانکردنی خوای گەورەش بە پەرستش و عیبادەت لەپێناو ئاسوودەیی و حەوانەوەی دەروونماندایە.

ڕاستە ژیانی دنیا لەناودەچێت و دەبڕێتەوە، بەڵام هەر لە مەیدانی ئەم ژیانەدا ئومێدی ژیانی تاهەتایی مسۆگەر دەکرێت و، بەو پێیەی

هیچ بەدیهێنراوێك ناتوانێت لەدەست فریشتەی گیانكێشان هەڵبێت و، پێویستە لە كۆتاییدا مەرگ بچێژێت و، ئەسپەردەی خاك بكرێتەوە؛ ئەوا بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو كەسەیە كە بە خۆشییە كاتییەكانی ژیان فریونەخوات و، پەی بە ئامانج لە بەدیهێنانی دەبات و، سەرقاڵی بەجێهێنانی فەرمانەكانی بەدیهێنەرە.

بەڕاستی كاتێك بە چاوی حیكمەتەوە لەم بوونەوەرە دەڕوانین، ناكرێت هیچ شتێك بە بێ مەبەست و سیستەمێكی ڕێكخەر هەژماربكەین، خۆ ئەگەر ئەو ئامانج و سیستەمە ڕێكخراوە نەبووایە ئێمەی بوونەوەرانی ئەم گەردوونە چۆن دەمانتوانی هەڵبكەین؟ كەواتە چۆن بتوانین بێ پەرستنی زاتی پەروەردگار لەم دنیا كورتخایەنەدا بژین؟!

## ئەمانە چەند ڕاستییەكی سەرسوڕهێنەرن:

شیكردنەوە و نموونەكان بێوێنە بوون، لەو ساتانەدا هەستمكرد كە ساڵەهای ساڵە ڕۆحم تینوو و برسی كردووە و، ئێستەش بانگێشتی خوانێكی ناوازە و شاهانەی ئیمان كراوە. (ڤامپیر نووری)یش زۆر بەتاسەوە گوێی گرتبوو و، بەئاماژەی سەر وتەكانی ئەو دوو گەنجەی پشتڕاستدەكردەوە.

کە (سەعید) بابەتەکەی تەواو کرد، (ڤامپیر نووری) لەبەرخۆیەوە وتی:

- شتانێکی چەند سەرسوڕهێنەرن.. باشە بۆچی ئێمە هێندە درەنگ لەمانە تێگەیشتین.

لەڕاستیدا ئەمە دانپێدانانی هەڵقوڵاوی ناخی بوو، ڕەنگە هەستی نەکردبێت کە لە زارییەوە دەرچوون، چونکە بە خەمبارییەوە دەیویست لێپرسینەوە و سەرکۆنەکردنی ناخی بشارێتەوە.

## ئەم (سەعیدی نوورسی)یە کێیە؟

(ڤامپیر نووری) یەکێك لە کتێبەکانی سەر مێزەکەی هەڵگرت و وتی:

- نووسەری ئەم کتێبە مەزن و کاریگەرانە کێیە؟ چ کارەیە؟ بۆچی ئێمە تا ئێستە نەمانناسیوە؟ کەمێك باسی ئەم نووسەرە و بەرهەمەکانیمان بۆ بکەن، با ئێمەش بیناسین.

(سەعید) وتی:

- نووسەرەکە ناوی (سەعیدی نوورسی)یە و، کتێبەکانیشی بەناوی (پەیامەکانی نوور)ەوە ناسراون. هەم نووسەر و هەم کتێبەکانیش زمانحاڵی ئەم سەردەمەن. بەڵام بەداخەوە هەرچەندە (سەعیدی نوورسی) هەوڵەکانی لەپێناو ڕزگارکردنی ئێمانی خەڵکی و، کۆمەڵگە بووە لە گێژاویی بێباوەڕی و نەفامیی و، خۆی زۆر لە

کاروباری سیاسەتەوە نەگلاندووە، هەندێك کەسی ناپاك و بەدنیاز ویستویانە ملکەچی مەرامە گڵاوەکانی خۆیانی بکەن، بۆئەمەش هەم خودی مامۆستا و هەم نووسراوەکانیشیان بە هەڵە بەخەڵکی ناساندووە.

بەداخەوە من و (زوبێر)ی هاوڕێشم بەهەڵە لەم نووسەرە و بەرهەمەکانی تێگەیشتبووین و، ئێمەش گەنجانێکی سەرلێشێواو و، دوور لەدین و، بێ ئامانج بووین، تا ئەوە بوو دووساڵ لەمەوپێش ڕێی ڕاستیمان دۆزیەوە و، ئەگەر (بەدیعوززەمان) و پەیامەکانی نوور نەبوونایە، ئێستە لەسەر تۆمەت و تاوان ڕاپێچی ئەم زیندانە دەکراین.

دڵنیابووم هەریەکێك لە زیندانیەکان بەخۆی دەوت: "کەواتە ئەم گەنجانەش سەرەتا وەك ئێمە بوون".

بەدیعوززەمان (سەعیدی نوورسی) لە ساڵی (١٨٧٦) لە گوندی (نوورس)ی سەر بە قەزای (هیزان)ی (بەتلیس) لەدایك بووە و، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٩٦٠)دا لە (ئورفە) کۆچی دوایی کردووە.

هەر لەتەمەنی منداڵییەوە خولیای خوێندن و فێبوونی زانست بووە، تەنانەت هەشتا کتێبی لە سێ مانگدا لەبەرکردووە. لەتەمەنی پازدە ساڵیدا بڕوانامەی تەواوکردنی خوێندنی بەدەست هێناوە و، مایەی سەرسوڕمان و دەستەوسانیی هەموو زانایانی سەردەمی خۆی

بـووه و، لــه تهمــهنی لاوییــهوه نازنــاوی (بــهدیعووزهمان)ی پــێ بهخشراوه.

لــه ســالّی (١٩٠٧)دا هاتووهتــه (ئهســتهنبولّ) و لــه خــانی (شهكرجی)دا بهكرێ لهژوورێكدا نیشتجێ بووه، كه شوێنێك بووه بۆ كۆبوونهوه و دهستهجهمبوونی زانا و ڕووناكبیرهكانی ئهو سهردهمه.

بــه دهرگــای ژوورهكهیــهوه تابلۆیــهكی ههڵواســیبوو، كــه لێــی نووسرابوو: "لێرهدا گرێی ههموو پرسـیاره ئاڵۆزهكـان دهكرێتـهوه و، وهڵامی گشت پرسیارێك دهدرێتهوه و، ههرگیز پرسیار له هـیچ كـهس ناكرێت". لهڕاستیدا بێ ئهوهی پرسیار له هیچ كهس بكات، دهیتوانی وهڵامی ههموو جۆره پرسیارێك بداتهوه.

خوازیاربوو ئهم ئوممهته له زهلكـاوی نـهفامیی ڕزگاربكـات و، هـهر بهم ئامانجهشهوه نامهیهكی بۆ سولّتان (عهبدولحهمید) ڕهوانـهكرد و، تێیـدا داوای لـه سـولّتان كردبـوو زانكۆیـهك بنیـات بنێـت، كـه وانـهی زانسـتهكانی ئـایین و زانسـتی سهدهمیشـی تێـدا بوترێتـهوه. بـهڵام لهلایـهن دهسـتوپێوهندهكانی سـولّتانهوه بـه بیـانووی شـێت بـوون ڕهوانهی نهخۆشخانهی (تۆپ تاش) كرا، بهڵام دواتر ڕاپۆرتی پزیشكی دهروونی بهشێوهیهكی حاشاههڵنهگر ژیریـی و دانـایی سـهلماند، هـهر لهو ڕاپۆرتهدا هاتبوو:

" ئەگەر تەنها گەردێکی شێتی لە (بەدیعوززەمان)دا هەبێت، ئەوا هیچ مرۆڤێکی عاقڵ لەسەر ڕووی زەویدا نییە".

تەنانەت بە تۆمەتی داوای پەیڕەوکردنی شەریعەت چەندین جار ڕەوانەی دادگا کراوە و، لێپرسینەوەی لەگەڵ کراوە. لەوەلامێکیدا بۆ پرسیارێکی دادگا دەڵێت:

" دەسا دڵنیابن لەوەی ئەگەر هەزار ڕۆحم هەبێت، ئامادەم هەموویان لەپێناو گرنگترین حەقیقەتەکانی ئەم گەردوونەدا ببەخشم، لەبەرئەوەی ئەم شەریعەتە تاکە هۆکاری خۆشبەختیی و دادپەروەریی ڕەها و، چاکە و خێری مرۆڤایەتییە، بەلام نەك بەو شێوەیەی داگیرکەران بانگەشەی بۆ دەکەن"، پاش ئەمە ئازادکرا، لەڕێی بایەزیدەوە تا گەیشتە مزگەوتی (سوڵتان ئەحمەد) ئەم دووعایەی وەك دروشمێك دووپاتدەکردەوە:

"بژی مەرگ و دۆزەخ بۆ ستەمکاران".

لە ساڵی (١٩١٠)دا لە (ئەستەنبوڵەوە) کۆچی کرد بۆ (وان) و، لەوێشەوە بۆ وڵاتی شامی ئەوکاتە –سوریای ئێستە– و، بە ئامادەبوونی نزیکەی دە هەزار کەس وتارێکی دا، کە بەناوی (الخطبة الشامية)وە ناسراوە، کە تێیدا ئاماژەی بە دەرد و نەخۆشییەکانی موسوڵمانانی ئەو سەردەمە دا و، چەندین ڕێگەچارەی گونجاوی خستەڕوو.

لــه ســاڵی (١٩١٢)دا گەڕایــەوە بــۆ (ئەســتەنبوڵ) و، ســەرلەنوێ درێژەی بە خەبات و تێکۆشـان دا لـەپێناو شـائامانجکەیدا، –ئـەویش بنیاتنانی ئەو زانکۆیە بوو کە زانستی سەردەم و زانسـتە شـەرعیەکان بەیەکــەوە گــرێ بــدات–، تەنانــەت نــاوی (مدرسـة الزهــراء)ی بـۆ دیـاریکرابوو. سـوڵتان (موحەممـەد ڕەشـاد)یش بـەدەم داواکاریەکـەی بەدیعوززەمانەوە هات و، لەکـەناری دەریاچـەی (وان) و، لـە ناوچـەی (ئەدرەمیت) بەردی بناغەی زانکۆکە دانرا. بەڵام هاتنەکایەی یەکـەم جەنگی جیهانی بووە کۆسپی بەردەم جێبەجێکردنی پرۆژەکە.

کاتێك جەنگ ڕاگەیەندرا نوورسی لەگەڵ سێ سەد قوتـابیی قوتابخانەکەیدا بەشداری جەنگی دژ بە ڕووسـیایان کـرد –کـە لـە شانی قەفقاسەوە هێرشی کردبوو– . کاتێك سوپای ڕووسی هاتـە ناو شاری (بـەتلیس)ەوە، مامۆسـتا و قوتابییـەکانی بەرگرییـەکی پاڵەوانانــەیان نیشــاندان و، بەســەختی بریـنــداربوو و، لەلایــەن سوپای ڕووسیاوە بەدیل گیرا و، ڕاپێچی ڕۆژهەڵاتی ڕووسیا کرا.

لەو ماوەیەدا کە لە (ڕووسـیا) بـەدیلی لـە زینـدانـدا بـوو، دووچـاری پێشهاتێك بوو، کە جاونەترسیی و بوێرییەکی بێوینەی تێـدا نیشـاندا، کاتێـك (نیکـۆلا نیکـۆلاڤیچ)ی فەرمانـدەی گشـتی بـەرەی قـەفقاس لەبەردەمیـدا تێدەپـەڕێت، مامۆسـتا لـەپێناو ڕێـز و شـکۆ و مـەزنیی

زانستدا بۆیی ڕاناوەستێت، هەر بەهۆی ئەم هەڵوێستەشیەوە بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت، بەڵام دڵسۆزیی و شکۆمەندبوونیی لە خزمەتی پەیام و بیروباوەڕەکەیدا لە پەتی سێدارە ڕزگاری دەکات.

بەهەوڵ و چەرمەسەرییەکی زۆر توانی لە زیندانەکانی ڕووسیا هەڵبێت و، خۆی بگەیەنێتەوە (ئەستەنبوڵ). پاش گەڕانەوەشی ڕێز و پێزانین و دەستخۆشییەکی زۆری ئاراستەکرا و، وەك ئەندامی خانەی حیکمەی ئیسلام (دار الحكمة الإسلامية) دامەزرێنرا.

پاش ئەوەی هێزە داگیرکەرەکان هاتنە ناو ئەستەنبوڵەوە، نوورسی هەستی بەمەترسی barودۆخەکە کرد، بۆیە هیممەتی دایە بەرخۆی و، کتێبێکی بەناوی (الخطوات الست)ەوە دانا و، بە هاوکاری شوێنکەوتووان و هاوڕێ و قوتابییەکانی ئەم کتێبەی بەنهێنی بەسەر خەڵکیدا دابەشکرد، لەم کتێبەشدا زۆر بەتوندی هێرشی کردبووە سەر ئینگلیز و داگیرکەران و، ئاماژەی بەوە کردبوو کە پێوستە جیهاد لەدژیان بکرێت و، ئەم کارەی ڕووبەڕووی ئەو بێهیواییە کردەوە کە باڵی بەسەر خەڵکیدا کێشابوو.

کاتێك بزووتنەوەی (بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەرانی ئەنادۆڵ) پێکهات، مامۆستا بە پشتگیری سەد و دوازدە موفتی و زانای ئایینی بە فەتوایەك پشتگیری خۆیان بۆ ئەم بزووتنەوەیە ڕاگەیاند. بەهۆی ناوبانگی جیهاد و ڕووبەڕووبوونەوەی بۆ دوژمنانی ئیسلام، چەند

جارێك لەلایەن حكومەتی ئەنقەرەوە بانگهێشت كرا، هەروەها پاش پێداگرییەكی زۆری (تەحسین بەگ)ی والی (وان)، كە دۆستێكی دێرینی بوو، مامۆستا لە ساڵی (١٩٢٢)دا ڕووی كردە (ئەنقەرە) و، لە وێستگەی شارەكەش پێشوازییەكی گەرمی لێكرا و، چەند پۆستێكیان بە موچەی زۆر باشەوە خستەبەردەم، بەڵام ئەو هەموو ئەمانەی ڕەتكردەوە و، بە دیمەنی باروگوزەرانی خەڵكی زۆر دڵتەنگ بوو، كە تەنها لایەنی ماددی و جەستەیی تێردەكەن و، لایەنی مەعنەوی و ڕۆحییان بەتەواوی پشتگوێ خستووە، لە سەروو هەموو ئەمەشەوە نوێژەكانیان زایەدەكەن، بۆیە وتارێكی زۆر كاریگەر و پاراوی لەبارەی نوێژ و حیكمەتەكانییەوە ئاڕاستەی ئەنجومەن كرد، چەندین بەرپرسی دەوڵەتیش لە پاش ئەم وتارەوە فەرزی نوێژەكانیان بەجێ دەگەیاند.

به پێداگریی لەسەر هەڵوێستی دنیانەویستی (ئەنقەرە)ی جێهێشت و، ڕووی كردە (وان) و، لەوێ بەتەواوی سەرقاڵی نووسین و ئامادەكردنی بابەت و بەرهەم و پەیامەكانی بوو.

لەم نێوەندەدا هێزە داپڵۆسێنەرەكانی دەوڵەت بەتۆمەتی بەرپەرچدانەوەی حكومەت و پلاندان بۆ كودەتا یەخەی بەدیعوززەمانیان گرت و، ڕاپێچی زیندان و دادگای سەربازیی یەك لەدوای یەكیان كرد و، مامۆستاش ئاوارەیی و دەربەدەریی و غەریبی

و چەرمەسەرییەکی زۆری چەشت. هەر لەم ماوەیەدا و، لە ناوەڕاستی سەرماوسۆڵەی زستاندا لە زینداندا ژەهرخوارد کرا.

مامۆستا سەرەڕای ئەو هەموو تۆمەتەی بۆیان هەڵبەست، بەلام دەستبەرداری بانگەوازەکەی نەبوو و، هیچ جۆرە ئەشکەنجە و، هیچ کەس و لایەنێك لە ئامانجەکەی سەرقاڵیان نەکرد و، لە نووسینەوەی (پەیامەکانی نوور) بەردەوام بوو.

بەڕاستی مامۆستا توانی بە نووسین و بەرهەمەکانی قەڵغانئاسا ئیمانی گەنج و نەوەی نوێ لە سەرگەردانیی بپارێزێت، لە گەرمەی یەکەم جەنگیی جیهانیدا، بێوچان سەرقاڵی نووسینەوەی (پەیامەکان) بوو.

دەبێت ئەوە چ جۆرە وشەگەلێکی مەزن و شکۆدار بن کە بەو دڵسۆزیی و لێبڕانەوە لە مەیدانی جەنگ و، ململانێی مەرگ و ژیان و، مان و نەمان و، گوێنەدان بە گیان و جەستە و، ڕۆح لەسەردەست، بێوچان سەرقاڵی تۆمارکردنیان بوو و، هەر بۆ خزمەتی ئیمان هەموو پاداشت و پارە و سامانێکی دەوڵەتی ڕەتکردەوە و، زیندان و ئاوارەیی بەسەر خۆشگوزەرانی و ساماندارییدا هەڵبژارد و، کێشە و گرفتەکانیش بارانئاسا بەسەر سینەیدا دادەبارین، بەلام مامۆستا پشوودرێژبوو و، ئارامی گرت و، لەئاست هەموو نەهامەتییەکدا

دەیفەرموو: "پێویستە ئەو ڕاستییە بچەسپێنم کە قورئان خۆرێکی مەعنەوییە و، هەرگیز تیشك و برسیکەدرەوشاوەکانی لەناوناچن".

بەدیعوززەمان هەندێکجار لەسەر لوتکەی چیایەك، یا لە سووچی زینـدانێکی تـار، یـاخود لـە میانـەی دوورخسـتنەوە و دەربەدەریـدا سـەرقاڵی نووسـنەوەی (پەیامـەکان) بـوو و، سـەراپای تەمـەنی بـۆ خزمـەتی ئـەم ئاینـەپیرۆزە تـەرخان کردبـوو و، بـەردەوام ئـەم هەڵوێستەی دووپات دەکردەوە و دەیوت: "لـەماوەی هەشتا ساڵی تەمەنمدا هەرگیز بۆ ساتێکیش چێژم لەم دنیایـە نـەبینیوە و، هـەموو ڕۆژەکانی تەمەنم لە مەیدانی جەنگ، یا لە زیندانی داگیرکاران، یا لـە زیندانی وڵاتەکەی خۆمدا بەسەربردووە، هیچ جۆرە ستەمدیدەییەك، یا ئازارێك، یا دەردیسەرییەك نـەما نەیکێشم، دیلیـی و ئاوارەیی و بێنەوایی زۆرم لـە مەیدانـەکانی جەنگدا چەشت. بەدرێـژایی چـەندین مـانگ لـە زینـدانی تاکەکەسـیدا ژیـنم بەسـەربردوو و، چـەندین جـار ژەهرخوارد کرام".

"لـەپێناو پارێزگـاریکردن لـە ئیمـان و بەختـەوەریی و سـەلامەتی کۆمەڵگـەدا سـەراپای گیـانم بەفیـداکرد و، هـەر لەوپێناوەشـدا بـۆ ئـاخیرەت دەکۆشـم، نـەك لـە خۆشەویستیی بەهەشـت و ترسـان لـە دۆزەخ. لەڕاستیدا پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە مەزنە هەزاران (سـەعید) ببنـەقوربانی. ئەگـەر ئـەم قورئانـە بـێ نـەوابێت و، کـەس

ئامادەنەبێت سەری بخات، ئەوا بەهەشتم بۆ چییە؟! پێویستم پێی نییە، چونکە دەبێتە زیندانییەکی نوێ بۆم" ئامادەم لەپێناو سەلامەتی ئیمانی نەتەوەکەمدا خۆم بکەمە سووتەمەنی ئاگری بڵێسەسەندوو، چونکە تەنانەت کاتێك کە جەستەم دەسوتێت، دڵم گوڵستان و گوڵزارئاسا دەبێت" .

بەدیعوززەمان ئامادەبوو سەروگیان و سامانی دنیای هەمووی بکاتە قوربانی تەنها یەك ڕاستی قورئان و ئیمان. دەبینین لە ساڵی (١٩٢٦)ەوە دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور و، تا ساڵی (١٩٥٠) زیاد لە (١٣٠) بەرهەم و نامیلکە و کتێبی قەبارەجیاوازی پێشکەشی خوێنەر کردووە و، بەمەش وەك ڕێنموویکارێکی مەزن و سەرمەشقێکی دانا و بێهاوتا و، موعجیزەیەکی مەعنەوی چاوەڕوانکراوی قورئان هاتە مەیدان.

(وتەکان، بریسکەکان، مەکتوبات، مەسنەوی نووریە، عەسای موسا، ئیشاراتول ئیعجاز، ژیانێکی مێژوویی، سکەی تەصدیقی غەیبی، پاشکۆی قەستەمونی، پاشکۆی ئەمیرداغ، پاشکۆی بارلا) و چەندین ناونیشانی دیکە لەنێو بەرهەمە ناوازەکانیدا بوون، کە نەك تەنها بۆ گەنجی وڵاتەکەی خۆی، بەڵکو بۆ ئیمانی نەتەوەکانی دنیاش بوونە قەڵغان، ئەمەش لەڕێی وەرگێڕانی تەواوی ئەم پەیامانە بۆ زمانە جیهانی و هەمەچەشنەکانی دنیا.

**(ڤـامپیر نـووری) چـیتر نـەیتوانی پـێش لـە هەڵچوونی ناخی بگرێت:**

(ڤامپیر نووری) زۆر بـە پەشـێویی هەسـتایەوە و، مشـتەکۆڵەیەکی کێشا بەسەرمێزەکەی بەردەمیدا و، وتی:

– یەعنی کەسێك کە ئەم هەموو چاکەیەی بۆ ئەم جیهانە هـەبووە، ئایا ڕەوایە هێشتا بەوشێوەیە بە ستەم وەڵام بدرێتەوە؟! هـا؟ شـتی وا نابێت ڕووبدات!

هێندە بە توندی و کاریگەربوونـەوە ئـەم قسـانەی کـرد، کـە پـاش ئەوەی کەمێك هێوربوویەوە وتی:

– داوای لێبووردن ئەکەم، لە پەستییدا هۆشم لای خۆم نەمابوو.

ئـەو ڕۆژەش باسـێکی سەرنجراکێشـی دیکـە خرایـەڕوو و، ئـاوازی ترپەی دڵـەکانی زیندانـەکان جیـاواز دەهاتەبـەرگوێ، لەسـەرووبەندی بـەهارێکی نـوێی تەمەنماننـدا بـووین و، چـرۆی ناسـکی بـاوەڕ هێـواش هێواش شکۆفەی دەدا و، ئەم کەشە نوورین و ئیمانییـە جارجـارە بـە ئەسرینی ڕاستگۆیانە پاراودەکرا.

ئەندێشەکانی (ڤامپیر نووری) لـە سـنوورێکی زۆر دووردا ئۆقرەیـان گرتبـوو، تەنانـەت هەسـتمان دەکـرد زۆرینـەی پەیوەندییـەکانی بـەم جیهانـــەوە پچـــڕاندووە، لەڕاســـتیدا ژووری زیندانەکـــەمان شـــێوەی یەکەیەکی چارەسەری دەروونی وەرگرتبوو.

دانیشتنەکانمان نزیکەی دە ڕۆژی خایاند، کە هەر لە دەمی بەیانییەوە تا ئێوارە بە تاووتوێکردنی باس و خواس و پرسیار و وەڵامی زۆر گرنگ و مەزنەوە سەرقاڵبووین، بەتایبەت (ڤامپیر نووری)، کە هەر ڕۆژێك لە ڕۆژی پێشتری زیاتر کاریگەردەبوو و، بە لافاوی هاوارکردن و، هەندێك جاریش بە فرمێسك گوزارشتی لە زریانی هەستەکانی دەکرد.

## ئەو ساتە سەرسوڕهێنەرە:

شەوێك هەموو لایەك لە قوڵایی خەودا بووین، کە پێشهاتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕوویدا و، هەمووان پێی کاریگەر بووین، ئەویش کاتێك بوو کە لە دەنگی هاتوهاوار و هەنسك و گریانی (ڤامپیر نووری) بێداربووینەوە، بەڕاستی دیمەنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، نەماندەزانی ئایا خەونی دیوە، یاخود هێشتا لەژێر کاریگەریی بابەتە باسکراوەکاندایە؟!

هەریەك لە زیندانییەکان جۆرە لێکدانەوەیەکی بۆ پێشهاتەکە دەکرد، بەڵام بەگشتی هەمووان زۆر بە ڕوونی گوێبیستی هەنسکەکانی (ڤامپیر نووری) بووین.

ئەو پیاوەی هەمووان لە ئامادەبوونیدا دەلەرزین و، هەموو خراپە و تاوان و کوشتنێك لە شاردا بە ئاگاداریی خۆی جێبەجێدەکران، ئێستە بەم شێوەیە لەسەر جێی نووستنەکەی بەچۆکدا هاتووە و، بە

هەردوودەستی سەری توند گرتووە و، زۆر بەئەستەم هەنسك دەدات و، ئەسرین دەڕێژێت. دەستوپێوەندەکانی بەپەلە خۆیانگەیاندەلای، بەلام بەدەست ئاماژەی دا: کە لێی نزیك نەبنەوە.

بۆ ماوەیەك ئەو بەو شێوەیە لەنێو هەنسکەکانیدا و ئێمەش لە سەرسوڕماندا ماینەوە، گەردەلوولی هەست و لێپرسینەوە و خۆسەرکۆنەکردن لە ناخی هەموومانـدا سەریهەڵدابوو و، وردودرشتی ژیانی ڕابردوومان لێکدەدایەوە و، تا دەهات زیاتر شەرمەزاردەبووین.

لەناکاو (ڤامپیر نووری) بەدەنگێکی ئاوێزان بە توندیی و هەستەوە وتی:

- هەستن، خێرا هەمووتان هەستن.

هەمووان سەریانسوڕمابوو لەم قسەیە، بەلام دەستبەجێ هەستانەوە، (ڤامپیر نووری) جلەکانی گۆڕی و دەستەجلێکی خاوێنی پۆشی، لەڕاستیدا بەم ڕەفتارانەی واقمان وڕمابوو. لەوکاتەشدا (زوبێر) و (سەعید) بەمەبەستی بەجێهێنانی نوێژی بەیانی لەخەوهەستابوون. (ڤامپیر نووری) بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وتی:

- کاکە سەعید، بەڕاستی تەمەنێکمان بەفیڕۆدا و، بە سەربەستییەکی کوێرانە خۆمان فریودا و، هەموو هەڵە و تاوانێکمان ئەنجامدا و، چەندین کەسمان چارەڕەش کرد، تاوان و گوناهەکانمان زۆر گەورە و بێویژدانانەن؛ بەلام پەروەردگار بەخشندە و میهرەبانە

و، ئێمەش لە تەوبەکردن و پەشیمانی و پاڕانەوە بۆ لێخۆشبوون، هیچ چارەیەکی ترمان نییە، کەواتە دە دەزنوێژ و نوێژمان فێرکە، با ئەم بەیانییە یەکەم نوێژمان بکەین، تا بچینە حزووری خوای گەورە و، بۆ یەکەم جار پەشیمانییەکی ڕاستگۆیانە بخەینەڕوو، چونکە ئیتر تەنها قاپیی میهرەبانی ئەو زاتە شك ئەبەین.

لەو کاتەدا هەنسکەکان هەناسەیان توند کردبوو و، نەیتوانی چیتر قسەبکات و، دایەوە پرمەی گریان. هەورێکی خەم و پەشیمانی خۆسەرکۆنەکردن سەراپای ژوورەگەی داگرتبوو.

هەموومان ڕێبواری شکستخواردووی ڕێی تاوان و هەڵە بووین و، بە هەمان زریانی هەست و سۆزی تاوسەندوودا تێدەپەڕین. لێزمەبارینی فرمێسکەکانی منیش تەواونەدەبوو و، لەوکاتەدا (زوبێر) بەلامدا تێپەڕی و، بە بینینی دیمەنی فرمێسکەکانم، بەدەنگێکی دڵسۆزانە پرسی:

– ئێوە ناوتان چی بوو؟

منیش وتم:

– ئێمرێ.

– ماشائەڵڵا، خوای گەورە ئەم فرمێسکە ڕاستگۆیانانەت بەخێر بۆ بنووسێت. پیرۆزباییتان لێدەکەم، ئەمە پاکوبێگەردیی ناخی ئێوە دەردەخات.

منیش لێمپرسی کە خەڵکی کوێیە؟ ئای پەروەردگارم، پاکوپێگەردیی بۆ تۆ خوایەگیان، ئەم گەنجە یەکێك بوو لە ئەندامانی بنەماڵەی دوژمنەسەرسەختەکانمان! بەزانینی ئەمە زۆر پەشۆکام و، دەستبەجێ کڕنووشم برد بۆ خوای گەورە.

ئای خودایە! مەگەر تەنها زاتی موبارەکت حیکمەت و دانایی بەدیهێنراوەکانت بزانیت! نەوەیەکی بنەماڵەی ئەو دوژمانانەی یەك یەك ئەندامانی خێزانەکەمیان کوشت، ئێستە هاتووە ئیمانم ڕزگاربکات، ئەمە چ نهێنی و حیکمەتێکی مەزنە؟!

پێم باشنەبوو پاش بەفیڕۆچوونی تەمەنێك لە دەربەدەریی و خوێنڕشتن و جەرگسوتان ئەم ڕاستییە بە (زوبێر) ڕابگەیەنم، دڵنیام ئەگەر ئەویش پێش من بیزانیایە هەر ئەو کارەی دەکرد. بەتەواویی دۆشدامابووم.

یەکەمین نوێژ:

لە ژووری زینداندا بەڕیز وەستاین بۆ نوێژ و، (سەعید) بووە ئیمامی پێشنوێژ و، (زوبێر)یش بانگبێژ و، هەموو زیندانیانی ژوورەکە بێ جیاوازیی و بە جەماعەت نوێژکەمان کرد.

ئای خودایە، ئەمە چ دیمەنێکی سەرسوڕهێنەربوو! ئەو بەندانەی کە تەمەنێك نوقمی زەلکاوی تاوان و نکوڵیکردن لە باوەڕبوون، ئێستە

بەڕیز لەبەر بارەگای میهرەبانیتـدا وەسـتاون و، بەفرمێسـکەوە داوای لێخۆشبوون دەکەن!

قوڵپی گریان و، هەنسك هەڵکێشـانمان ئـاوێزانی یەکدی بووبـوون، هەستمدەکرد لەو ساتەدا هـەزارەها فریشـتەی ڕەحمـەت شـایەتحاڵی ئەو دیمەنـەبووبن و، پیرۆزبـایی و دەسـتخۆشـییان لێکـردبین. دەنگـی زوڵاڵ و میهرەبانانـەی (سـەعید) هێنـدەی تـر کەشـەکەی نـوورانی دەکـرد، منـیش هـەر کـە دەنگـی هەنسـکەکانی (ڤـامپیر نـووری) دەهاتەبەرگوێم، نەمدەتوانی جڵەوی فرمێسکەکانی خۆم بکەم.

لە کڕنووشـدا بەتـەواوی بوونمـەوە فرمێسـکی تەوبـە و پەشـیمانیم دەڕشت و لـەخوای گـەورە دەپاڕامـەوە لێمخۆشـبێت، چـونکە منـیش وەك هەموو زیندانیەکانی دیکە تارمایی تاوان و سەرپێچی لەپێشچاوم لانەدەچـوو و، نەمـدەزانی بـۆ داوای لێخـۆش بـوون لـە کـام تاوانـەوە دەستپێبکەم.

هـەمووان دڵنیـابووین دیمـەنی خوێنڕشـتن و سـتەم و خـەڵکی بێچـارەکردنمان هـەر وا بـە ئاسـانی لەیادناچێت و، تـا دوایـن سـاتی تەمەنمان پەشیمانی بەرۆکمان بەرنادات.

پاش تەواوکردنی نوێژەکە تێبینیمان کرد لە چاوەکانی (سەعید) و (زوبێر)یشەوە فرمێسك باریوە. دیارە ئـەوانیش پشـکیان لـەو کەشـی فرمێسکبارانەدا هەبووە.

هەموو ئەسرینمان دەڕشت:

(ڤـامپیر نـووری) لـە سـەر بەرماڵەکـە هەسـتایەوە و، دەسـتەکانی بەرزکردەوە و، منالّ ئاسا دەگریا و دەپاڕایەوە:

- یاڕەبی، هاتووم بۆ بارەگاکەت، گوناهەکانم بێ سنوورن و، جگە لەتۆش هیچ پەناگەیەك شك نابەم، لێت ئەپاڕێمەوە دوعاکـانم لێقبـولّ کە، چونکە چیتر بەرگەی ڕەتکردنەوە ناگرم.

خوایـــەگیان، تـــۆ بـــەمیهرەبانیی خـــۆت ئـــەم دەرفەتـــەت پـــێ بەخشیمەوە، کەواتە منیش تا مردن لە قاپی موبارەکتدا ئەپاڕێمەوە.

سوپاس و ستایش بۆ تۆ خوایەگیان، کە پـێش مـەرگم لەگـەلّ ئـەم ڕاستییانەدا ئاشتتکردمەوە و، لەمەودوا ئەوپەڕی ئاواتم ناسـاندنەوەی خەڵکیی ئەبێت بەم ڕاستییانەی ئیمان، چـونکە ئـەوە تـەنها هۆکـاری سـەرفرازی خەڵکییـە و، تـا دڵـەکان بـەم ڕاسـتییانە ئاشـنانەکرێنەوە سەرفراز نابن.

منـــیش بـــە ڕوانـــین لـــە دیمەنـــەکان و، هەســـتمدەکرد ژووری زیندانەکەمان بووەتە گۆشەیەکی بەهەشت. هەمووان لەژێرکاریگـەریی ئەو کەشە ئیمانییەدا نقومبووبوون، ترپەی دڵیشمان جۆرە پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونێك بوو لە پەروەردگار.

بەم شێوەیە (ڤامپیر نووری) گەڕایەوە باوەشی ئیمان، ئەم گەڕانەوەیەش بەواتای ڕزگاربوونی شارەکە دەهات لە دەست تاوان و ستەم و بەدکارییەکانی.

من تێناگەم، لەکاتێکدا ئەم ڕاستییە مەزن و ڕزگاریکارانە هەن، کەواتە بۆچی لەلایەن دەسەلاتدار و دەستەبەرپرسەکانی کۆمەڵگەوە ناخرێنەڕوو و، گەنجانی پێگۆشناکرێن؟! خۆ گومانی تێدا نییە کە ملیۆنەها کەسی ئاتاج بەم ڕاستییانە هەن، کە ئەگەر لەکاتی گونجاودا دەستگیرۆیی نەکرێن، ئەوا چارەنووسیان لادان و سەرپێچی و تاوان و زیندان، یاخود مەرگ دەبێت. لەڕاستیدا سیستمی زیندان هیچکات ناتوانێت کەسی تاوانبار و لادەر لە گێژاوی تاوانکاریی ڕزگار بکات، بەڵکو تەنها ئەم ڕاستییانە تروسکەی هیوای کەسانی لەم جۆرەن و، پێویستە هەر کەسێکیش خۆی بە نیشتمانپەروەر دەزانێت، ئەمە لەبەرچاو بگرێت.

ئەو ڕۆژە دانیشتنەکەمان لە نوێژی بەیانی تا نوێژی نیوەڕۆ بەردەوامبووبوو، کە پاسەوانەکە دەرگاکەی کردەوە و وتی:

– (سەعید) و (زوبێر) ئەمڕۆ دادگایی دەکرێن.

سۆز و میهری خوای گەورە چەندە مەزنە! ئەم گەنجانە پاش ئەوەی بە ڕاستییەکانی ئیمان ئاشنایان کردینەوە، وادەی ماڵئاوایی لێکردنیان نزیک بووبوویەوە، وەك ئەوەی دوو فریادڕەسی نوورانی بن

و، بــۆ دەربازکردنمــان ســەردانیان کــردبین. بەخــەم و پــەژارەی جودابیەوە ماڵئاواییمان لێکردن و، بەفرمێسك بـەڕێمان کـردن. بـەڵام سـوپاس بـۆ خـوای گـەورە، پـاش نیـوەڕۆی هـەمان ڕۆژ هـەواڵی ئازادکردنیان گەیشت و، بەرەو ڕزگارکردن و بەهانەوەچوونی کەسانی بێچارەی دیکەی وەك ئێمە بەڕێکەوتبوون.

خوای گەورە دڵەکانیان دامـەزراو و، دەروونیـان ئـارام و، تواناـیـان بەرەکەتداربکات، بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی.

(سەعید) و (زوبێر) ئازادکران، بـەڵام لـەپاش خۆیـان (پەیامـەکانی نوور)یــان بــۆ جێهێشــتبووین و، ئێمــەش بــەردەوام بــووین لــە بەجێگەیانـدنی نوێـژ و پەرستشـەکان و، باسـکردنی بابەتـە ئیمـانی و پەروەردەییەکان.

ماوەیەك پێش ئەوەی لە زیندان ئازاد بکرێم، لـە حـەمامی زینداندا دەزنوێـژم دەشـت، کـە سـەرم بـەرزکردەوە، مامەپیرەنوورانییەکـەم بینی و، بەدەنگێکی میهرەبان و هێمنەوە وتی:

– "پیرۆزت بێت، ئەم ڕاستییانە ئێوە لە ژیانی تاهەتاییدا سەرفراز دەکەن، نەکەن دەستبەرداریان بن".

لـەو سـاتەدا چـەندین پرسـیار بـە خەیاڵمـدا هـات، کـە دەمویسـت وەڵامـەکانیانم دەسـت بکـەوێت، بـەڵام ئەفسـوس لـە چـاوتروکانێکدا دیارنەما، حەمامەکەش لەخۆم زیاتر کەسی دیکەی تێدا نەبوو.

**ئازادكراين:**

زۆری نەخایاند، من و تەنانەت (ڤامپیر نووری)یش بە لێبووردنی گشتی ئازادكراین، ئێستە ئەو ژینێكی ئارام و دوور لە تاوان و یاخیبوون بەسەردەبات و، رۆژەكانی بە پەرستش و نوێژ و خواپەرستییەوە بەرێدەكات.

منیش خێزانێكم پێكەوەنا و، بوومە باوك، لەسەر ناوی خوشك و براكانم ناوی منداڵەكانم ناوە. هاوسەرەمیهرەبانەكەشم كەسێكی تابلێی باوەڕداره. لەڕاستیدا من و هاوسەرەكەم بڕیارمانداوە هەرگیز ڕێی ئیمان و خواپەرستی بەرنەدەین، چونكە ئارامیی و ئاسوودەیی تەنها لەو ڕێیەوە بەدەستدێن.

خوای گەورە گەیشتن بە كانی باوەڕ و، پاراوكردنی دڵ بە ڕاستییەكانی بكاتە پشكی هەمووان... (ئامین)

**كۆتایی**

## نامە و سەرنجەکانی خوێنەران

بەسەرهاتی ئێمریۆ، هەر لەیەکەمین لاپەڕەوە تا کۆتایی تۆفانێکە لە فرمێسك..

لەم ڕۆمانەوە فێریی چەندین وانەی پڕپەندی ژیان بووم و، بە زۆرێك لە تایبەتمەندییەکانی بوونم لەمگەردوونەدا ئاشنابووم، تا بتوانم سوپاسگوزاری بەدیهێنەر بم. تەنانەت بەهۆیەوە ڕەگوڕیشەی چەند سیفەتێکی وەك پشوودرێژیی و ئارامیم لە ناخمدا بەدیکرد..

بەڕاستی سەراپای بوونم بە باسوخواس و ڕووداوەکانی ژیانی (ئێمریۆ) کاریگەربوو و، توانیم تارمایی خراپە و تاوان لەژیانمدا وەدەرنێم. ئێستەش تەنها هێندەم لەتوانادایە کە ئەم کتێبە وەك دیاری دەستم پێشکەشی هەموو ئەوانە بکەم، کە وەك خۆم ڕێی ڕاستی ژیاینیان لێهەڵەبووە، بەڵکو فریادڕەسێك بێت بۆ دەروونی ماندوو و شەکەتیان.

سوپاس و دەستخۆشیم بۆ نووسەر و خامەبەدەستی ڕۆمانەکە و، هیوادارم لە نەخشاندنی ئەم بەرهەمانە بەردەوام بن.

**فاتمە قەیسەرلی**

******

ماموستای بەڕێز..

پاش تەواوبوونم لە خوێندنەوەی ڕۆمانی (ئێمریێ)، خوازیاربووم دەستبەجێ پەیوەندیتان پێوەبکەم، تا ئەگەر بەچەند دێڕێکی کورتیش بووە هەستوسۆزی خۆم لەئاست ئەم بەرهەمەتاندا دەربڕم، چونکە بەڕاستی منتان لە خەوی غەفڵەت بێدارکردەوە.

من گەنجێك بووم، کە بەهیچ شێوەیەك خولیای کتێبخوێندنەوەم نەدەکرد، بەڵام لەسەر ڕاسپاردەی هاوڕێیەکم قایلبووم، کە ڕۆمانەکەتان بخوێنمەوە، بەڵام لەماوەی دوو سەعات کەمتردا تەواوبووم لە خوێندنەوەی، لەمیانەی خوێندنەوەیدا دڵنیابووم: کتێبگەلێك هەن، کە بەڕاستی هەستبزوێن و کاریگەر بن، چونکە بەنێو ئازار و خەم و گرێکانی دەروونندا گوزەر دەکەن.

(ئێمریێ) بووە مەرهەمی سارێژکاری ئەو زامانەی ناخم کە ساڵەهایە ئازارم دەدەن، خوای گەورە سارێژکاری خەم و ئازاری بەڕێزیشتان بێت، منیش هەوڵدەدەم بەپێی توانا ئەم ڕۆمانە لای کەسانی دیکە خۆشەویست بکەم و، بەدیاری پێشکەشیان بکەم.

خوای گەورە نموونەی بەڕێزتان زیاتربکات، ئینشائەڵڵا تەمەنێکی نوورینی بەبەرەکەت بەسەردەبەن، تا بەرهەمی نوورینی دیکەی هاوشێوەی (ئێمریێ) بنەخشێن.

لەگەڵ ڕێزمدا.....

ئێمریێ پەلماز

خوێنـەری بـەردەوامی بەرهەمـەکانی بـەڕێزتانم و، زۆرێـك نییـە لـە خوێندنەوەی ڕۆمانی (ئێمرێ)ی بەڕێزتان تەواوبووم، بێگومان تەواوی ڕۆمانەکەم بەیەکجار خوێندەوە، لەڕاستیدا پێویسـتە ڕاشـکاوانە بڵـێم کە نووسینەکانتان ڕۆحیەتێکی بـەرز و بـەڕێز و، شـێوازێکی ڕەوان و، پەیام و پەند و ئامۆژیی زۆر لەخۆدەگرن، تەنانەت چارەسەری زۆرێـك لە دەرد و نەخۆشییەکانی دەروونی لاوی ئەم سەردەمەن.

نازانم چـی بنووسـم! لەڕاسـتیدا پـاش خوێندنـەوەی ئـەم ڕۆمانـە، تێگەیشتم کە پێویست ناکات لە چاوەڕوانی ئـەو مامەپیرەنوورانییـەدا بـین، تـا بـەرەو ڕاسـتییەکانی بـاوەڕ کەمەندکێشـمان بکـات، چـونکە سەرچـاوەی کانیـاوی هــەموو نهێنییــەکانی بــاوەڕ لــە نــاخ و دڵ و دەروونی خۆماندایە.

من بەپێویستی دەزانم هەمووان ئەم ڕۆمانە بەنرخـە بخوێننـەوە و، بەنێو باسوخواسەکانیدا گوزەر بکەن.

خوای گەورە ئێوەی مامۆستا تەمـەن درێـژبکات، تـا لـە نووسـینی ئەم کتێبە دەروونپەروەردەکار و ئیمانیانە بەردەوام بن.

لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیمدا...

**نورای**

# پێڕست

# EMRE

MAZLUMUN AHI

## HALİT ERTUĞRUL

ئـەم ڕۆمانـە.. سەرگوزشـتەی ڕاسـتەقینەی ژیانێکـی لێوانلێـوە لـە بێچارەیـی و ئازارچەشـتن و تەنیایـی و بێکەسـی.. نووسـەریش پاش هـەوڵ و کۆشـانێکی ئاوێزان بـە ئەسـرین و حەسرەتکێشـان، بەرگی وشـەو دەربڕینی بەبەر ڕووداوەکاندا کردووە.

چارەنووسـی پڕپەنـدی ئێمرێ داستانئاسا تـۆی خوێنەر کەمەندکێشـدەکات و، بـەرەو تێڕامـان و هەڵوێسـتەکردن ئاڕاسـتەت دەکات؛ لەهەمـان کاتـدا ڕێنموویيکارێکـی میهرەبانت دەبێت.

لەگـەڵ هەڵدانـەوەی لاپەڕەکانـی ئـەم پەرتووکـەدا، هەسـتدەکەیت ئومێدێکـی نوێ لـە ناختدا چـرۆدەکات و، تروسکەیەك لەپشـتی تارمایی بێهیواییەوە دەدرەوشێتەوە و، بۆ ڕێبواریی ڕێیەکی ڕاست ئامادەت دەکات.

0-0153-0000-5



9 780015 300005

نرخی (٣٥٠٠) دینارە



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

ara.m@hotmail.com